## ئەم کتێبە:

* چەند نامیلکە و وردە باسێکن کە مامۆستا (**بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی**) لە (پەیامەکانی نوور)دا بە زمانی تورکی داینـاون و، بە تایبەتی ئاراستەی (خوشکان)ی کردوون. پاشان لەم کتێبەدا کۆی کردوونەتەوە.
* مامۆستا (**ئیحسان قاسم صالحی**) لە زمانی تورکی‌یەوە کردوویەتی بە عەرەبی.
* (**فاروق ڕەسووڵ یەحیا**) لە عەرەبی‌یەوە کردوویە بە کوردی.
* مامۆستا (**حسەین حەسەن کەریم**) بەم کوردی‌یەدا ڕۆشتووەتەوە و لەگەڵ دەقی عەرەبی‌یەکەدا بەراوردی کردووە.
* مامۆستا (**عەبدولکەریم عەبدوڵلا ڕەفعەت**) پیایدا ڕۆشتووەتەوە و لەگەڵ دەقە تورکی‌یەکەدا بەرامبەری کردووە.

* چاپی یەکەم: هەولێر ١٤١٦ك - ١٩٩٦ز
* چاپی (شەرعی و بژارکراوی) سێهەم: بەیرووت ١٤٣٣ك - ٢٠١١ز
* لەسەر ئەرکی وەرگێڕ لە چاپ دراوە.
* (ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا) نەخشەی بەرگی کێشاوە و سەرپەرشتیی چاپی کردووە.

* ژمارەی سپاردنی (١٤٣)ی ساڵی (١٩٩٦)ی لە وەزارەتی ڕۆشنبیریی هەرێمی کوردستان پێ دراوە.

بەشێك لە پەیامەكانی نوور

# ڕابەری خوێشكان

بەدیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

دایناوە

فارووق ڕەسووڵ یەحیا

كردوویە بە كوردی

تێبینی‌یەك:

ئـەم كتێبـەی بەردەسـتی خوێنـەری بەڕێز، لە چەند نامیلكە و كورتە باسێكی "پەیامـەكانی نـوور" پێكـهاتووە، كـە ئاراسـتەی (خوشـكان) كـراون، چ ئەوانـەیان لاون و چ ئەوانـەش كـە تەمەنێكیان هەیە. مامۆستا نوورسی بۆ خۆی لەو پەیامانە هەڵی بژاردوون و، بەم شێوەیە بڵاوی كردوونەتەوە. (وەرگێڕ)

لە بریسکەی بیست و چوارەم:

## گفتوگۆیەك لەگەڵ خوشکانی دوارۆژمدا

باسمه سبحانه

لە چەند "پارێزگایەك"دا دەمبینی ئافرەتان بایەخێکی گەلێ گەرموگوڕ و خاوێن بە "پەیامەکانی نوور" دەدەن. کاتێکیش بۆ جاری سێهەم هاتم بۆ ئەم قوتابخانەی زەهرای مەعنەوی‌یە، کە شاری پیرۆزی "ئیسپارتە"یە، بیستم ئەو ئافرەتە پاك و پیرۆزانەی خوشکانی دوارۆژم چاوەڕوانی ئەوەن دەرسێکیان پێ بلێم بە چەشنی ئەو دەرسانەی لە مزگەوتەکاندا بۆ پەند و ئامۆژگاری دەوترێنەوە. چونکە بۆم دەرکەوت ئەو خوشکانە گەلێ پشت بەو دەرسانەم دەبەستن کە تایبەتن بە نوورەوە بە ڕادەیەك کە لە سەرووی وزە و توانای منەوەیە.

بەڵام من دووچاری چەندین نەخۆشیم و لەوپەڕی لاوازی و ماندووییدام، تەنانەت توانای قسە و بیرکردنەوەشم نەماوە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، ئەم شەو "ختوورە"یەکی بەهێزم بە دڵدا هات، کە ئەمەی خوارەوەیە:

(تۆ، پازدە ساڵ پێش ئێستا، لەسەر داخوازیی لاوان پەیامی "ڕابەری لاوان"ت نووسی و، کەسانێکی زۆریش سوودیان لەو پەیامە وەرگرت. کەچی ئافرەتان پێویستیی زیاتریان بەو چەشنە "ڕابەرە" هەیە لەم سەردەمەدا).

جا هەرچەندە من گیرۆدەی کۆڵەواری و لاوازیم، بەڵام لەبەر ئەم "ختوورە"یە، بەوپەڕی پوختی و لە نێوان "سێ سەرنج"دا هەندێ مەسەلەم بۆ

ئەو خوشكە پیرۆز و كیژە لاوانەی خۆم نووسی لەو مەسەلانەی كە پێویستیان پێیان دەبێت.

❑ سەرنجی یەكەم:

لەبەر ئەوەی گرنگترین بناغەی پەیامەكانی نوور "شەفەقەت"ە و، ئافرەتانیش ڕابەران و پێشەوایانی شەفەقەت و پاڵەوانانی میهرەبانین، ئەوا بەپێی سروشتی خۆیان لە هەموو كەسێك زیاتر پەیوەستەی پەیامەكانی نوورن. سوپاس بۆ خوای گەورە، لە زۆر شوێندا هەست بەم پەیوەندییە سروشتییە دەكرێت.

"خۆبەخت كردن"یش كە لە شەفەقەت و میهرەبانیدایە، گرنگییەكی گەلێ مەزنی لەم سەردەمەی خۆماندا هەیە، چونكە ئیخلاسی ڕاستەقینە و فیداكاریی بێ بەرامبەر دەگەیەنێت.

بەڵێ، كە دایك بۆ ڕزگاركردنی جگەرگۆشەكەی و، بێ ئەوەی چاوەڕێی هیچ پاداشتێك بكات و بەپێی فەرمانبەریی سروشتیی خۆی و بە ئیخلاسێكی ڕاستەقینە، خۆی و گیانی بۆ منداڵەكانی بەخت دەكات.. ئەم كارە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە پاڵەوانێتییەكی بەرز و بڵند و بێ وێنە لە ئافرەتاندا هەیە، بە چەشنێ كە دەتوانن بە دۆزینەوە و دەرخستنی ئەم پاڵەوانێتییەی دەروونیان ژیانی دنیا و قیامەتیان ڕزگار بكەن.

بەڵام چەند تەوژمێكی خراپكار هەن نایەڵن ئەم ڕەوشتە بەنرخ و بەرزەی ئافرەتان دەربكەوێت، یان لە غەیری شوێنی ڕاستەقینەی خۆیدا دەیخەنە كار و، بەم پێیە لە ڕێ و شوێنی خۆی لایدەدەن و بە شێوەیەكی نابەجێ بەكاری دەهێنن.

وا لە نێوان سەدان نموونەی ئەمەدا، تەنها یەك نموونە دەهێنینەوە:

دایكی میهرەبان هەردەم ئامادەیە بۆ هەموو فیداكاری و خۆبەختكردنێك، تاكو بەلا و گیروگرفت و تیاچوون لە منالەكەی دوور بخاتەوە. ئەمەش بۆ ئەوەی لە دنیادا سوودی پێ بگات. ئیتر منالەكەی لەسەر ئەم بناغەیە پەروەردە دەكات و، هەموو سامانێكیشی لە پێناوی ئەوەدا خەرج دەكات كە كورەكەی ببێت بە مرۆڤێكی مەزن و فەرماندەیەكی گەورە. دەبینیت لەم پێناوەدا لە قوتابخانەی زانستە ئایینیەكان دەری دەهێنێت و بۆ ئەوروپای دەنێرێت، بێ ئەوەی بیرێك لەوە بكاتەوە كە بەم كارەی ژیانی هەمیشەیی ئەو كورەی خستووەتە مەترسیەوە!

ئەم دایكە لە كاتێكدا هەوڵ دەدات كورەكەی لە بەندیخانەی دنیا رزگار بكات، گوێ نادات بەوەی بیخاتە بەندیخانەی هەمیشەیی دۆزەخەوە. كەواتە هەڵسوكەوتێك دەكات ئەوپەری پێچەوانەی سروشتی خۆیەتی. ئەوەتا لە بریی ئەوەی كورەكەی بە جۆرێك پێ بگەیەنێت كە لە دوارۆژدا شەفاعەتی بۆ بكات، كەچی وا پێیدەگەیەنێت كە لەودنیادا سكاڵای لەدەست بكات، چونكە كورێك كە بەو چەشنە پەروەردە كرابێت، لەودنیادا سكاڵا لەدەست دایكی دەكات و پێی دەڵێت:

*(بۆچی لە دنیادا ئیمانت بەهێز نەكردم تاكو بوویت بەهۆی ئەم تیاچوونەی ئێرەم)؟!*

ئنجا لەبەر ئەوەش بە تەواوی و بەپێی پەروەردەی ئاینی ئیسلام پەروەردە نەكراوە، ئەوا - هەر لەم دنیایەدا - گوێ بە شەفەقەتە بێ وێنە و ناوازەكەی دایكی نادات، بەڵكو لەوانەیە قسوور و كەمتەرخەمیی زۆریشی لە رووداو بنوێنێت!

بەلام ئەگەر ئەو دایكە هەوڵ بدات ئەو شەفەقەتەی كە پێی بەخشراوە، بە باشی و لە جێی خۆیدا بەكاربهێنێت و، لە رێی شەفەقەتەوە كورە لاوازەكەی

خۆی لـە بەندیخانـەی هـەمیشـەیی - کە دۆزەخە - و لە ئیعدامی هەتاهـەتایی - کـە مردنـە لـە گومڕاییـدا - ڕزگـار بکـات، ئـەوا دوای وەفـاتی خـۆی ئـەو کـوڕەی هەمیشـە نـوور و ڕووناکی بۆ گیـانی دایکـی میـهرەبانی دەنـێرێت. چونکە بە ئەندازە و چەشنی ئەو کردەوە چاکانەی کە ئـەو کـوڕەی لـە دنیـادا ئەنجامیان دەدات، کـردەوەی چـاك لـە لاپـەڕەی کردەوەکـانی ئـەو دایکەشـدا تۆمار دەکرێن. هـەروەك بـۆی دەبێـت بـە کوڕێکـی پـاك و دڵسـۆز و، پێکـەوە ژیـانێکی هەمیشـەیی بەسـەر دەبـەن و، لای خـوای گـەورەش شـەفاعەتی بـۆ دەکات و، سکاڵاشی لەدەست دەرنابڕێت.

بەڵێ، یەکەم مامۆستای مرۆڤ، کە لە هەموو کەسێك زیاتر کاریگـەریی تێدا هەیە، دایکیەتی!

وا بەم بۆنەیەوە ئەم واتایە ڕوون دەکەمەوە کە بـە تـەواوی و بێ گومـانی لـە خۆمدا هەستی پێ دەکەم:

سوێند بە خوای گەورە، قووڵترین و دامەزراوترین وانەیەك وەرم گرتووە و هەمیشـە لـە دەروونمـدا نـوێ دەبێتـەوە: ئامۆژگـاری و وانـە مەعنەوییـەکانی دایکمن - خوا لێی خـۆش بێـت - بـە چەشـنێ کـە لـە نـاخی سروشـتمدا ئـەو دەرسانەی ئـەو جێگـیر بـوون و، لـە جەستەشمدا وەك "تـۆو"یـان لـێ هـات لـە درێژایـی مـاوەی تەمـەنمدا کـە خـۆی لــە هەشـتا سـاڵ دەدات، هەرچـەندەش دەرسـم لـە هەشتا هـەزار کـەس وەر گرتـووە. تەنانـەت لـەو دڵنیاییەشـدام کـە دەرسەکانی تر لەسەر بناغەی ئەو تۆوانە سەوز بوون و بنیات نراون.

واتە: ئامۆژگاری و دەرسـەکانی دایکـم کـە لـە سـاڵانی یەکـەمی تەمـەنمدا ئاراستەی سروشـت و گیـانی منـی کـردن، مـن بـە چـەند تۆوێکـی بنـەڕەتییان دەزانم لە نێوان ئەو ڕاستییە مەزنانـەی کـە ئێسـتا لـە تەمـەنی هەشـتا سـاڵیمدا دەیانبینم.

نموونەی ئەمە:

"شەفەقەت" كە گرنگترینی چوار بناغەكانی ڕێبازی ژیانمە، هەروەها "میهرەبانی و بەزەیی" كە ڕاستییەكی مەزنی پەیامەكانی نوورە، بەوپەڕی دڵنیاییی دەبینم كە هەردووكیان هەڵقوڵاوی كردارەكانی ئەو دایكە میهرەبانە و حاڵەتە بەشەفەقەتەكانی و، دەرسە مەعنەوییەكانی ئەون.

بەڵێ، ئەو شەفەقەت و میهرەبانییەی كە بە ئیخلاسی ڕاستەقینە و خۆ بەختكردن و فیداكارییەوە لە دایكایەتیدا هەن، لەم سەردەمەی ئێستادا بە جۆرێكی ناڕەوا و هەڵە و نابەجێ بەكارهێنراون و دەهێنرێن، چونكە دایك لەمرۆدا بیر لەو گەنجینانە ناكاتەوە كە لە ئەڵماس بەنرخترن و كوڕەكەی لە دوارۆژدا بەدەستیان دەهێنێت، بەڵكو ڕووی ئەو كوڕەی ڕووەو ئەم دنیایە وەردەچەرخێنێت كە چەند وردە شووشەیەكی فانی و لەناوچووش ناهێنێت. ئیتر تەنها لەم لایەنەوە شەفەقەت و میهرەبانیی خۆی بۆ كوڕەكەی دەنوێنێت.

ئەمەش – لە ڕاستیدا – بەكارهێنانی چەوت و نابەجێی ئەو شەفەقەتەیە كە هەیەتی.

ئەو شتەی پاڵەوانێتیی ئافرەتان دەچەسپێنێت لە خۆ بەخت كردنیاندا، كە بێ هیچ پاداشت و سوودێك بۆ خۆیان و بە بێ ڕیاكاری و خۆدەرخستن دەیكەن، بریتییە لەو نموونە بچووكەی شەفەقەت و میهرەبانیی دایكایەتی كە لە مریشكدا دەیبینین، ئەوەتا هێرش بۆ سەر شێر دەبات و، گیانی خۆی بۆ پارێزگاریی بێچووەكانی بەخت دەكات!

لەم كاتەی ئێستادا، پێویست ترین كار و گرنگترین بناغەی پەروەردەی ئیسلامی و كرداری دوارۆژ: "ئیخلاس"ە.

جا ئەم پاڵەوانییە بێ وێنەیەی "شەفەقەت" بێ هیچ گومانێك ئەو "ئیخلاسە ڕاستەقینە"یەی لە دووتوێدایە.

خۆ ئەگەر هەرکاتێ ئەم دوو خاڵە لەو کۆمەڵە پیرۆزەدا - کە پیر و کۆمەڵی ئافرەتانە - دەرکەوتن، ئەوا دەبن بە خولگە و جەمسەری بەختەوەرییەکی گەلێ مەزن لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا.

بەڵام خۆبەختکاریی باوکان هەرگیز بە خۆڕایی و بێ بەرامبەر نییە، بەڵکو لە چەندین لایەنەوە، کە دەگەنە سەد، داخوازی پاداشت و بەرامبەر دەبێت. بەلای کەمەوە ناوبانگ و شانازیی لە بەرامبەرەوە دەوێت!

بەڵام بە داخەوە ئافرەتە پیرۆز و پاکەکان، لە ئەنجامی لاوازی و کۆڵەوارییانەوە و، بۆ مەبەستی خۆدەربازکردنیان لە دەستی شەڕ و خۆسەپاندنی مێردە ستەمکارەکانیان، لە ڕێیەکی ترەوە خۆیان دووچاری ڕیا و مەرایی دەکەن.

❑ سەرنجی دووهەم:

ئەم ساڵ لە ژیانی کۆمەڵایەتی گۆشەگیر و دوورە پەرێز بووم. بەڵام لەسەر داخوازیی هەندێ برا و خوشکانی نوور سەیرێکی دنیام کرد. زۆربەی ئەو برادەرانەی چاوم پێ کەوتن و هاتن بۆ لام سکاڵای ژیانی ناوخێزانم لێ دەبیستن.

لە ناخەوە گەلێ خەمم خوارد و لەبەر خۆمەوە وتم:

(بۆچی فەساد کەوتووەتە ناو ئەم ژیانەشەوە؟ خۆ ژیانی ناو خێزان قەڵای قایمی مرۆڤە - بە تایبەتی موسڵمان - چونکە خێزان بەهەشتە بچووك و دنیا خنجیلانەکەی ئەوە)!

بە دوای ئەو هۆیەدا گەڕام کە ژیانی خێزانی ئاوا تێکداوە. لە ئەنجامدا بۆم دەرکەوت چەندین ڕێکخراوی نهێنی و پەنهان هەن لە پێناوی لە ڕێ دەرکردن و تێکدانی ڕەوشتی لاواندا هەوڵ دەدەن و بە گەرمی تێدەکۆشن ڕێی ئارەزووبازییان بۆ ئاسان بکەن و، بەو پێیە بەرەو خراپکاری و

هەرزەیی دەیاندەنەبەر. تاكو كۆمەڵی موسڵمان لێك بترازێنن و لەم ڕێیەوە زیان بە ئایینی ئیسلام بگەیەنن.

هەروەك هەستم كرد كە چەندین ڕێكخراوی تر هەن بە پەنامەكی و نهێنی و بەوپەڕی لێبڕانەوە هەوڵ دەدەن ئافرەتانی بێ ئاگا و خۆش باوەڕ بۆ چەندین ڕێی تاوانكاری و گوناهباری هان بدەن و، تێگەیشتم كە لەم لایەنەوە مشتەكۆلێكی توندوتیژ لەم نەتەوەی ئیسلامە دەوەشێنرێت.

دەسا ئەی خوشكانم و ئەی كچە مەعنەوی‌یە لاوەكانم!

وا من بە چەشنێكی بێ گومان ڕوونی دەكەمەوە بۆتان كە:

چارەسەری ڕاستەقینە و شیفابەخش بۆ ڕزگاركردنی ئافرەتان لە چنگی ئەو تەقالایانەی كە بۆ لە ڕێ دەركردنیان و تێكدانی ژیانی دنیا و قیامەتیان دەدرێت و، تاكە هۆی پارێزگاریی ڕەوشتە بەرزەكانی سروشتیان لە داوی فەساد و خراپكاری، تەنها لە پەروەردەكردنیاندایە بە پەروەردەیەكی ئیسلامی، كە هەموو لایەنەكانی ژیان دەگرێتەوە.

ئێوە ئەنجامی ئەو بارودۆخەتان بیستووە كە ئەو تاقمە پیرۆزە - ئافرەتان - لە ڕووسیادا دووچاری بوون!

لە بەشێكی پەیامەكانی نووردا وتراوە:

مێردی ژیر هەرگیز خۆشەویستیی هاوسەرەكەی لەسەر بناغەی جوانی‌یەكی ڕواڵەتی بنیات نانێت، كە دە ساڵ ناخایەنێت. بەڵكو دەبێ ئەو خۆشەویستی‌یەی لەسەر بناغەی "شەفەقەت"ەكەی بێت، كە جوانترین و بەردەوامترین جوانی‌یەكانی ئافرەتە..

ئەم خۆشەویستی‌یەشی بە ڕەوشت جوانیی ئەو هاوسەرەی ژیانی پتر بەهێز و توندوتۆڵ دەكات، ئەو ڕەوشت جوانی‌یەی كە تایبەتە بە سروشتی

ئافرەتەوە. بۆ ئەوەی ئەو هاوسەرە لاوازەی تا بەرەو پیری بڕوات ئەو خۆشەویستییەش هەر بەردەوام بێت، چونکە ئەو هاوسەرەی تەنها هاوڕێی ژیانی کاتیی دنیای نییە، بەڵکو هاوسەر و هاوڕێی خۆشەویستی ژیانی هەمیشەیی و نەمریشیەتی. ئیتر هەتا بەساڵدا بچن، ڕێز و میهرەبانیی نێوانیان پتر زیاد دەکات.

بەڵام ژیانی ناو ئەو چەشنە خێزانەی کە لە باوەشی شارستانێتیی نوێدا پەروەردە بوو بێت، ژیانێکە هەردەم لەوەدایە بڕووخێت و شیرازەی بپچڕێت، چونکە پەیوەندیی نێوان خێزانی وا لەسەر بناغەی هاوڕێیەتییەکی کاتییە کە جودایی هەمیشەیی بەدوادا دێت.

هەروەها لە بەشێکی پەیامەکانی نووردا وتراوە:

پیاوی بەختەوەر ئەو مێردەیە کە چاو لە ژنی خواناسی خۆی دەکات و ئەمیش – وەك ئەو – مرۆڤێکی باش و خواناس دەبێت، بۆ ئەوەی لە ژیانی هەمیشەیی و نەمریدا هاوسەرەکەی ژیانی لەدەست دەرنەکات.

هەروەها ئەو ژنەش چەندە بەختەوەرە کە دەبینێت مێردەکەی ئاییندارە و، ئەمیش وەك ئەو، دەست بە ئاییندارییەوە دەگرێت، تاکو هاوسەر و هاوەڵە هەمیشەییەکەی لەدەست دەرنەچێت. بەم چەشنە و لە نێوان بەختەوەریی دنیایدا بەختەوەریی هەمیشەییشی دەست دەکەوێت.

هەروەها ئەو مێردە چەندە بەدبەختە شوێن ژنێك دەکەوێت کە خۆی هاویشتووەتە باوەشی هەرزەییەوە و ئەمیش هاوبەشیی دەکات و، بۆ ڕزگارکردنی تێناکۆشێت.

ئەو ژنەیش چەندە بەدبەختە کە خراپکاری و لە ڕێ لادانی مێردەکەی دەبینێت و، دەچێت بە جۆرێکی تر لاسایی دەکاتەوە.

"وەیل"یش بۆ ئەو ژن و مێردەی كە هەریەكەیان یاریدەی ئەوی تر دەدات لە پاڵ پێوەنانیدا بەرەو ئاگری دۆزەخ، واتە هەریەكەیان هانی ئەوی تر دەدات كە لە زرق و برقی شارستانێتیدا پتر ڕۆبچێت.

ناوەرۆكی ئەم ڕستانەش كە لە پەیامەكانی نووردا هاتوون، ئەمەیە كە:

لەم سەردەمەی ئێستادا جگە لە ڕێی پەروەردەبوون بە ئادابی ئیسلام، كە شەریعەتی پاك و خاوێن و پیرۆزی ئیسلام دەستنیشانیان دەكات، هەرگیز ناگونجێ مرۆڤ لەزەت لە ژیانی خێزانی ببینێت و، بەختەوەریی دنیا و قیامەتی دەست بكەوێت و، ڕەوشتە بەرزەكانی ئافرەتانیش ئاشكرا بن.

گرنگترین خاڵ و لایەنی ژیانی خێزان لەم سەردەمەدا بریتی‌یە لەوەی كە:

ئەگەر "ژن" خراپكاری و خیانەت و بێ وەفایی لە "مێرد"ەكەیەوە ببینێت، ئەویش - لە ڕقدا - واز لەئەرك و فەرمانبەری‌یە بەرزەكەی خۆی دەهێنێت كە وەفا و متمانەیە و، دەچێ تێكیاندەشكێنێت. ئەو كاتەش ڕێسای ئەو خێزانە بە تەواوی تێكدەچێت و بە خۆڕایی هەڵدەوەشێت و شیرازەی دەبچڕێت. بە چەشنی تێكدانی ڕێسا لەناو سوپادا.

كەواتە دەبێ "ژن" بە تەواوی لێ ببڕێت و تێبكۆشێت ناتەواویی مێردەكەی پڕ بكاتەوە و، قسووری چاك بكات، بۆ ئەوەی هاوسەرە هەمیشەییەكەی ڕزگار بكات..

دەنا ئەگەر خۆی دەربخات و، بەم خۆدەرخستن و ڕووتی‌یەشی بیەوێت خۆی لای خەڵكی خۆشەویست بكات، ئەوا لە هەموو لایەكەوە دووچاری زیان دەبێت، چونكە خیانەتكار هەر لەم دنیایەدا سزای خۆی دەچێژێت و، لەبەر ئەوەش ئەم لە سروشت لایداوە، چونكە ئافرەت بە سروشت توخنی نامەحرەم ناكەوێت و بێزیان لێ دەكاتەوە و، لە بیست كەسی نامەحرەمدا

خۆی لە هەژدەیان دەپارێزێت، کەچی لەوانەیە "پیاو" لە سەد ئافرەتدا بێز لە سەیر کردنی یەکێکیشیان نەکاتەوە.

جا هەروەك "ژن" لەم لایەنەوە دووچاری ئەشکەنجە دەبێت، بەم بێ وەفایی و نەهێشتنی متمانە و ئەمانەتەش خۆی تۆمەتبار دەکات. ئیتر بەم چەشنە، سەرباری لاوازی‌یەکەی، ناشتوانێت پارێزگاریی مافەکانی خۆی بکات.

پوختەی ئەم قسانە ئەوەیە کە:

هەروەك لە ڕوانگەی شەفەقەت و سۆز و میهرەبانی‌یەوە خۆبەختکردن و ئیخلاسی ئافرەت لە هی پیاو گەلێ بەرزترە و، پیاوان لەوەدا هەرگیز بە ئافرەتان ناگەنەوە و بە هیچ جۆرێك لەوان ناچن.. بە هەمان جۆر ئافرەتانیش لە هەرزەیی و خراپکاریدا بە پیاوان ناگەنەوە!

لەبەر ئەوەشە کە ئافرەت هەر بە سروشت و بەدیهاتنی لاوازی خۆی، لە نامەحرەم دەترسێت و، خۆی بە ناچار دەزانێت پەنا بۆ (پۆشتەیی) ببات. چونکە ئەگەر پیاو لە پێناوی لەزەتێکی هەشت دەقیقەییدا تووشی کارێکی خراپ ببێت، ئەوا تەنها چەند لیرەیەك زیانی لێ دەکەوێت، بەڵام سزای لەزەتێکی هەشت دەقیقەیی ئافرەت کۆڵێکی قورسی هەشت مانگی و، ئەرکی پەروەردە و بەخێوکردنی منالێکی بێ کەسە بۆ ماوەی هەشت ساڵ! واتە ئافرەت لە خراپکاریدا بە پیاو ناگاتەوە، بەڵام تۆڵەی خراپکاری‌یەکەی چەندین جاری تۆڵە و سزای پیاوە.

ئەم ڕووداوانە دەگمەن نین و، بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە:

"ئافرەتان" چەند بەدیهێنراوێکی پیرۆزن و، بۆ ئەوە بەدی هێنراون تاکو بین بە سەرچاوە و کانگای ڕەوشتە بەرزەکان. چونکە دەتوانین بڵێین ئافرەتان

توانا و قابیلییەتی خراپكارییان بۆ چەشتنی تام و لەزەتی دنیا نزیکە هەر تێدا نەبێت. واتە ئافرەتان چەند بەدیهێنراوێکی پاك و پیرۆزن، بۆ ئەوە بەدی هێنراون تاکو لە چوارچێوەی پەروەردەی ئایینی ئیسلامدا ژیانێکی خێزانیی پڕ بەختەوەری بەسەر ببەن.

کەواتە ڕسوایی و سووکی و نەمان بۆ ئەو ڕێکخراوانەی کە بۆ لەڕێ دەرکردنی ئەو پاك و خاوێنانە تێدەکۆشن و هەوڵ و تەقالایان دەخەنەکار!

لە خوای گەورە داواکارم خوشکانم لە شەڕی ئەو هەرزە و خراپکارانە بپارێزێت. ئامین.

خوشکەکانم! بە تایبەتی ئەم قسەیە بۆ ئێوە دەکەم:

خەرجی و نەفەقەی خۆتان بە دەستی خۆتان پەیدا بکەن، وەك ئافرەتە پاکەکانی لادێ. ئەمە باشترە لەوەی کە زیان لە خۆتان بدەن و بەهۆی خەم و خەفەتی ژیانەوە مل بۆ دەستەڵاتی مێردی خراپکاری بەدڕەوشتی چاولێکەری ئەوروپا کەچ بکەن.

خۆ ئەگەر بەش و چارەنووسی هەرکامێکتان مێردێکی نەگونجاو بوو، با بەو بەش و چارەنووسەی خۆی ڕازی بێت و قەناعەت بکات، بەشکو خوای گەورە بەم قەناعەت و ڕازی بوونەی، مێردەکەشی بۆ چاك بکات. دەنا لە ئەنجامدا ناچار دەبێت بۆ تەڵاقدان ڕووەو دادگاکان بڕوات، وەك دەبیستم لەم کاتانەدا ئەم دیاردەیە ڕوودەدات. دیارە ئەمەش بە هیچ جۆرێك شایانی عیززەتی ئیسلام و شەرەفی نەتەوەی موسڵمان نییە.

❑ سەرنجی سێهەم:

خوشکە ئازیزەکانم! بێ هیچ گومانێك ئەوە بزانن کە:

ئەو تام و چێژانەی لە دەرەوەی بازنەی شەرعدان، چەندین ئەوەندەی تام و لەزەتەکانیان ئازار و گیروگرفتیان تێدایە. پەیامەکانی نوور ئەم

ڕاستی‌یەیان بە سەدان بەڵگەی بەهێز و ڕووداوی بێ گومان چەسپاندووە. دەتوانن بە درێژی لە پەیامەکانی نووردا ئەو بەڵگانە ببینن. بۆ نموونە: وتەی شەشەم و حەوتەم و هەشتەمی "وتە بچووکەکان" و "ڕابەری لاوان" لە بریی من ئەم ڕاستی‌یەیان بە تەواوی ڕوون کردووەتەوە.

کەواتە بەو چێژ و لەزەتانەی کە لە سنووری شەرعدان، دڵنیا و ڕازی بن، بۆ نموونە: یاری و گەمە و گاڵتەکردن لەگەڵ جگەرگۆشە بێگەرد و خاوێنەکانتان و، دانیشتنتان لەگەڵیان لە ماڵی خۆتاندا، تام و لەزەتێکی گەلێ خاوێنە و، بە سەدان جار لە کەیف و شادیی سینەما باشتر و خۆشترە.

بەوپەڕی دڵنیاییەوە بزانن کە: لەزەتی ڕاستەقینەی ئەم دنیایە لە ئیمان و لەو شتانەدایە کە لە سنووری ئیمان دەرنەچووبن و، هەموو کردەوەیەکی چاکیش لەزەتێکی مەعنەویی تێدایە. بەڵام گومڕایی و تاوانکاری هەر لەم دنیایەدا چەندین ئازاریان تێدایە کە لەزەتەکانیان دەشێوێنن و تاڵیان دەکەن. پەیامەکانی نوور ئەم ڕاستی‌یەیان بە سەدان بەڵگەی گومانبڕ چەسپاندووە. من خۆم بە "عین الیقین" و لە ڕێی چەندین تاقیکردنەوە و ڕووداوی زۆرەوە بینیومە کە:

"ئیمان" تۆوی بەهەشتی تێدایە و، گومڕایی و "هەرزەیی"ش تۆوی دۆزەخ!

ئەم ڕاستی‌یەم چەندین جار لە پەیامەکانی نووردا نووسیوە، بە چەشنێ کە سەرسەختترینی ئینکاریکەران و یاخی بووان و، کارشناسە ڕەسمی‌یەکان و تەنانەت دادگاشی دەمکوت و دەستەوسان کرد و، نەیانتوانی ئەم ڕاستی‌یە زامدار بکەن.

کەواتە ئەی خوشکە پاك و پیرۆزەکانم و، ئەی ئەوانەش کە وەك کچی بچووکی من وان!

با ئێستا لە پێش هەموو شتێكدا "پەیامی پۆشتەیی" و ئنجا "ڕابەری لاوان" و "وتە بچووكەكان" لە بریی من دەرس بە ئێوە بلێن. چونكە بیستم حەز دەكەن لە مزگەوتدا دەرسێكتان پێ بڵێم. بەڵام نەخۆشییە سەختەكەم و لاوازییە لەڕادەبەدەرەكەم و چەندین هۆی تر دەرفەتی ئەوەم نادەن. لەبەر ئەوە – ئەی ئەو خوشكانەی كە ئەم وانەیەم بۆ نووسیون و ئەوانیش دەیخوێننەوە! – بڕیارم دا ئێوەش وەك قوتابیانی نوور بكەم بە هاوبەشی دەستكەوتەكانی دوارِۆژم و هەموو دوعاكانم!

جا ئەگەر توانیتان پەیامەكانی نوورتان دەست بكەوێت و ئەو پەیامانەتان خوێندەوە یان گوێتان لێ ڕاگرتن، ئەوا ئێوەش وەك براكانتان (قوتابیانی نوور)تان لێ دێت، دەبن بە هاوبەشی هەموو دەستكەوتە مەعنەوی و دوعاكانیان، بەپێی دەستوورەكەی خۆمان.

دەمویست لەمە زیاترتان بۆ بنووسم، بەڵام لەبەر نەخۆشی و لاوازیی زۆر سەخت و توندوتیژ و پیریم و چەندین ئەركی زۆری تری وەك ڕاستكردنەوە و پێداچوونەوەی دەستنووسی پەیامەكان كە چاوەڕێم دەكەن، بەم ئەندازەیە وازم لە نووسین هێنا.

الباقي هو الباقي

برای موحتاجی دوعا و نزاتان

**سەعیدی نوورسی**

لە پاشبەندی ئەمیرداغ:

## مژدە و بێدارکردنەوەیەك

(نامەیەکە تایبەتە بە "ئەرکان"ی ئێستای قوتابخانەی زەهراء)

**مژدەیەکی گرنگە بۆ پیرەژنـان و.. بێدارییەکیشـە بـۆ ئـەو کیژانەی کە دەیانەوێت شوو نەکەن.**

ناوەرۆکی فەرموودەی: "علیکم بدین العجائز" مـرۆڤ هـان دەدات چـاو لە پیرەژنان بکات. بەو واتایەی کە لـە ئـاخر زەمـاندا ئیمـانی دامـەزراو لای پیرەژنان دەبێت.

لەبـەر ئـەوەی یـەکێك لـە چوار بناغـەکانی پەیامـەکانی نـوور بریتی‌یـە لـە "شـەفەقەت" و.. ئافرەتـانیش ڕابـەر و پێشـەوای شـەفەقەت و میــهرەبانین، بـە چەشنێ کە ترسنۆکترین کەسیان لە پێناوی ڕزگار کردنی منالەکـەیدا گیـانی خۆی بەخت دەکات و.. دایکان و خوشکانی بـەڕێزیش لـەم چەشـنە کـات و سەردەمەدا ڕووبەڕووی چەندین ڕووداوی گەورە گەورە دەبنەوە..

لەبەر ئەوە، ئەم بێدارییەی خوارەوە بۆ دڵم ئیلهام کرا کە:

پێویسـتە ڕاسـتی‌یەکی سروشـتیی تایبـەت بـە کچـان ڕوون بکرێتــەوە، هەرچـەندەش نـەدەبوو بـاس بکرایـە و بڵاوبکرایەتـەوە، چونکـە تایبەتـە بـەو ئافرەتانەی دەیانەوێت، یاخود ناچار بوون، شوونەکەن. لەبەر ئەوە، دەڵێم:

کچەکانم! خوشکەکانم!

ئەم زەمان و سەردەمەی ئێمە لە زەمان و سەردەمەکانی پێشوو ناچێت، چونکە وا ماوەی نیو سەدەیە پەروەردەی نوێی (ئەوروپایی) لە بریی پەروەردەی ئیسلامی جێی خۆی لە کۆمەڵدا کردووەتەوە..

دەبینیت ئەو کەسەی کە دەبوو - بەپێی پەروەردەی ئیسلام - ژنی بۆ ئەوە بهێنایە خۆی لە گوناهباری پێ بپارێزێت و، بیکات بە هاوەڵ و هاوسەری هەمیشەیی خۆی و، خولگەی بەختەوەریی ئەم دنیای، کەچی دەبینیت - بە کاریگەریی پەروەردەی ئەوروپایی - ئەو هاوسەرە لاواز و بەدبەختەی ژیانی دەکات بە ژێر دەستەی خۆسەپاندن و زاڵبوونی بەردەوامی خۆی و، تەنها لە تافی لاوی‌یەکەیدا خۆشی دەوێت، تەنانەت لەوانەشە گەلێ زیاتر لەو حەوانەوەیەی بۆی ئامادە کردووە، دووچاری ماندوویی و دەردیسەریی ژیانی بکات.

ئیتر ژیان لەو ئافرەتە بێچارەیە بە ئەشکەنجە و ئازار دەچێتە سەر، بە تایبەت ئەگەر بەپێی پێوەری شەرع هاوکووفی یەك نەبن، چونکە لەو چەشنە کاتەدا هیچ چاودێری‌یەکی مافە شەرعی‌یەکان ناکرێت. خۆ ئەگەر مونافەسە و غیرەت و چاولێکەرییش تێکەڵ بەو ژیانە ببێت، ئەوا گیروگرفتەکە چەندین جار زیاد دەبێت.

تەنها سێ هۆکار هەن ئافرەت بۆ ئەم شووکردنە هان دەدەن:

❐ هۆکاری یەکەم:

دانایی خوای گەورە شەوق و ئارەزووی لە مرۆڤدا بۆ وەچەخستنەوە داناوە و، پاداشتێکیشی بۆ ئەنجامدانی ئەو فەرمانبەری‌یە سروشتی‌یە پێ داوە کە "لەزەت"ە.

پیاو لەوانەیە لە پێناوی ئەو لەزەتەی کە (دە) خولەك دەخایەنێت تەنها ئازار و ماندوویی یەك سەعاتی بیتەڕێ، ئەگەر حەڵاڵ بێت.

بەڵام ئافرەت بەرامبەر بەو تام و لەزەتەی کە (دە) خولەك دەخایەنێت. نزیکەی دە مانگ منالّ لە سکیدا هەڵدەگرێت، سەرەڕای ئەوەی کە بە درێژایی دە سالّیش ئەرکی دەردیسەری و ئازاری ژیانی منالّەکەی دەکەوێتە ئەستۆ. واتە ئەو لەزەتە (دە) خولەك خایەنە گرنگیی ئەو مەیل و شەوق و ئارەزووە سروشتییە دەسڕێتەوە، چونکە ئەم ماندوویی و گیروگرفتە یەکجار زۆر و بەردەوامانەی لێ دەبێتەوە.

کەواتە نابێت هەست و ئارەزووەکانی ئافرەت، ئەو مەیلە سروشتییە بۆ شووکردن بزوێنن.

❑ هۆکاری دووهەم:

ئافرەت، هەر بە سروشت و لەبەر ئەو لاوازییەی لە بەدیهاتنیدا هەیە، پێویستی بە یەکێکە لە کاروباری ژیاندا یارمەتیی بدات..

جا باشتر وایە - وەکو ئافرەتانی گوندنشین - هەولّ بدات بە دەستی خۆی خەرجی و نەفەقەی خۆی پەیدا بکات. ئەمەی دەیان جار باشترە لەوەی کە ئەم پێویستییە سروشتییە ناچاری بکات ملکەچ بێت بۆ دەستەڵات و زەبر و زاڵی مێردێك کە - وەك باری ئێستامان - بە پەروەردەیەکی جگە لە پەروەردەی ئیسلام پێگەیشتبێت و، لەسەر زۆرلێکردن و فەساد ڕاهاتبێت. چونکە لەوانەیە ئەو ئافرەتە بە "ڕیاکاری و تێکدانی پەرستن و ڕەوشتەکانی خۆی" کە خولگەی ژیانی دنیا و قیامەتی ئەون، هەولّ بدات ڕەزامەندیی ئەو مێردەی بەدەست بهێنێت. هەموو ئەمانەش لە پێناوی ئەو گوزەرانە ساکار و کەمەدا.

جا لەبەر ئەوەی بەدیهێنەری بەخشندە، بە چەشنی ئەو ڕۆزی‌یەی لە مەمکاندا بۆ بێچووانی دەنێرێت، ئاوا ڕۆزیی ئەو ئافرەتانەش دەدات، ئەوا چاوگێڕان بۆ مێردی نوێژنەکەری بەدڕەوشت و ملکەچ بوون بۆی لە پێناوی ڕۆزیدا، کارێکە هەرگیز لە شان و شکۆی "ئافرەتە قوتابی‌یەکانی نوور"دا نی‌یە.

❑ **هۆکاری سێهەم:**

"خۆشویستن و گەمە و گاڵتەکردن لەگەڵ منداڵدا" لە سروشتی ئافرەتدا هەیە. ئەو شتەش کە ئەم مەیلە سروشتی‌یەی ئافرەت بەهێز دەکات و بۆ شووکردن هانی دەدات ئەوەیە کە لە پاشاندا ئەو منداڵە لە دنیادا خزمەتی بکاتەوە و، لە قیامەتیشدا ببێت بە شەفاعەتکاری و، دوای مردنیشی چاکەی بۆ بنێرێت.

بەڵام ئەو پەروەردە ئەورووپایی‌یەی کە ئێستا جێی پەروەردەی ئیسلامیی گرتووەتەوە، کارێکی کردووە کە مەگەر یەکێك یان دوو لەناو (دە) کوڕدا لەگەڵ دایکی خۆیدا باش بێت و، بە دوعا و کردەوەی باش "چاکە" لەسەر لاپەڕەی کردەوەکانی دایکیدا تۆمار بکات و، گەر پیاوچاك دەرچێت، لە قیامەتیشدا شەفاعەتکاری بێت و، بەو پێیە پاداشتی شەفەقەتی دایکی بداتەوە.. بەڵام هەشت دانەکەی تر، هەموو ئەم شتانە پشتگوێ دەخەن.

کەواتە نابێت ئەم مەیلە سروشتی و تاسە دەروونی‌یەی خۆشویستنی منداڵ و گەمە و گاڵتە لەگەڵیان، لەم کات و سەردەمەدا، ئافرەت گیرۆدەی گیروگرفتەکانی ئەم ژیانە سەختە بکات، ئەگەر بە تەواوی و بە چەشنێکی تەواو بێ گومان ناچار نەبێت.

جا لەسەر بناغەی ئەم ڕاستی‌یەی پێشوو، ڕوو دەکەمە کچانم لە قوتابییانی نوور، لەوانەی شوونەکردنیان پێ باشترە، پێیان دەڵێم:

دەبێ خۆیان ڕووت نەكەن و، جەستەیان دەرنەخەن و، بەو پێیە خۆیان هەرزان فرۆش نەكەن، هەتا مێردێكی ئیمانداری پیاوچاكی ڕەوشت جوانیان دەست دەكەوێت، كە بە تەواوی بۆ ئەوان بگونجێت. بەڵكو دەبێ بە كچی بمێننەوە، ئەگەر مێردێكی هاوكووفیان دەست نەكەوت، وەك پیاوە پاڵەوانەكانی قوتابیانی نوور كە ژنیان نەهێناوە. هەتا كەسێك داوای دەكات كە لەگەڵیدا بگونجێت، لەوانەی كە بە پەروەردەی ئیسلام پەروەردە بوون و، خاوەنی ویژدانی زیندوون. تاكو ئەو جۆرە مێردە ببێت بە هاوڕێی ژیانێكی هەمیشەیی كە شیاوی بێت و، لە پێناوی لەزەتێكی سەرپێی دنیایدا بەختەوەریی دوارۆژی نەدۆڕێنێت و، لە خراپكارییەكانی شارستانێتیدا نوقم نەبێت.

سەعیدی نوورسی

# ئاماژەیەکی کورت بۆ ڕاستییەکی گرنگ

چەند فەرموودەیەکی پیرۆز ئاماژە دەکەن بۆ ئەوەی کە:

لە ئاخر زەماندا ڕاستییەکانی ئیمان لە لای ئافرەتان ڕوونتر دەردەکەون، بە چەشنێ کە - تا ڕادەیەك - دەتوانن خۆیان لەو شتانە بپارێزن کە گومڕایی ئەو سەردەمە مرۆڤیان پێ لەناودەبات. هەروەها وەك لە فەرموودەی: "علیکم بدین العجائز"دا دەیبینین، هاندان هەیە بۆ چاولێکەریی پیرەژنان لە ئاخر زەماندا.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە "ئیخلاس"ی هەلقولاوی سۆز و شەفەقەتی ئافرەتان - کە پاڵەوان و پێشەوای سۆز و شەفەقەت و میهرەبانین - نایەڵێت دووچاری ئەو لەناوچوون و لەڕێ ترازانە بین کە لەم سەردەمەدا "گومڕایی" گەوزاوی ناو ڕیاکاری تووشی مرۆڤی دەکات. بەم چەشنە ئەوان دەست بە ئیسلامەتیی خۆیانەوە دەگرن و وازی لێ ناهێنن.

فەرموودەیەکی تر ئەمەی تێدایە کە دەفەرموێت: "إن أبا البنات مرزوق". واتە: لە ئاخر زەماندا منالی کچ زۆر دەبن و، ئەوانیش بێگەرد و خاوێن دەردەچن و، خوای گەورەش بەرەکەت دەخاتە ڕۆزییانەوە.

زووتر نهێنیی ئەم فەرموودەیە و هاوچەشنیم نەدەزانی. بەڵام - سوپاس بۆ خوا - لەم دواییەدا شتێك لە نهێنییەکانیان تێگەیشتم. وا بەوپەڕی کورتی ئاماژەی بۆ دەکەم:

منالّی مرۆڤ وەك بێچووی زیندەوەران نین، چونكە لە كاتێكدا ئەو بێچووانە لە ماوەی دوو یان سێ مانگدا دەتوانن پشت بە خۆیان ببەستن، منالّی مرۆڤ پێویستی بە پارێزگاری و چاودێری‌یەكی بەسۆز و میهرەبانە كە (دە) سالّ یان زیاتر دەخایەنێت.

لەبەر ئەمە، دەبێ دایكان بەوپەڕی لێبڕانەوە پارێزگاری و شەفەقەتیان بۆ منالّەكانیان بەردەوام بێت، كە ئەمەش خوو و ڕەوشتێكە لە مرۆڤدا - بە پێچەوانەی زیندەوەرانی تر - پتر ڕەگی داكوتاوە.

بەلاّم دانایی خوای گەورە، خوو و ڕەوشتی "غیرەت و شەرەفمەندی"ی لە سروشتی پیاواندا داناوە، تاكو بتوانن یارمەتیی دایكانی لاواز و مندالاّنی دەستەپاچە و كۆلەوار بدەن.

لە ناوەندی ئەم خوو و ڕەوشتی غیرەت و شەرەفمەندی‌یەدا پالّەوانی‌یەكی ناوازە و بێگەرد هەیە كە بێ هیچ بەرامبەر و پاداشتێكە، بەلاّم ئێستا هەتا ڕادەیەك تێكچووە و گۆڕانی بەسەردا هاتووە. لە ئەنجامی ئەمەشدا ئەو پالّەوانی‌یە لە زۆربەی خەلّكیدا لاواز بووە، كەچی ئەو خوو و ڕەوشتە سروشتی‌یەی ئافرەتان (كە شەفەقەت و میهرەبانی‌یە) وەك خۆی ماوەتەوە و تێك نەچووە.

ئافرەتان - بەم خوو و ڕەوشتە سروشتی‌یەیان - چەندین خزمەتگوزاریی مەزن لە نێوان موسلّمانانی ئاخر زەماندا ئەنجام دەدەن. ئەو فەرموودە پیرۆزانەش بە هێما ئاماژە دەكەن بۆ گرنگیی ئەم خوو و ڕەوشتە سروشتی‌یە و كاریگەریی لە كۆمەلّدا و، بۆ ئەوەی كە چۆن دەبن بە بناغە و پشتیوان بۆ موسلّمانان لە چوارچێوەی ئیسلامدا.

# شوێنکەوتنی سوننەت لە ژن هێناندا

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته أبداً دائماً

ئەمە وەڵامی پرسیارێکە لە ڕۆژنامەی وڵاتە بیانییەکاندا بڵاوکراوەتەوە[1]. ناوەڕۆکی پرسیارەکە بەم جۆرەیە:

---

(١) وا لە خوارەوە دەقی ئەو نامەیە دەهێنین کە کاتی خۆی یەکێك بۆ مامۆستا نوورسیی ناردووە:

(چەند پەیامێکی نوور و مێژووی ژیانتم خوێندەوە. لە بەسەرهاتی ژیانتان بینیم یەکێك لە کارە تایبەتییەکانتان "ژن نەهێنان" و پەیدا نەکردنی هیچ پەیوەندییەکە بە دنیاوە. ئەمەش کاری لە قوتابیانی نوور کردووە و لەوانیشدا دەرکەوتووە.. جا مادەم ئەمە لەگەڵ ئەو ئایەتەی سوورەتی "النساء" کە دەفەرموێ: ﴿فَانْكِحُوا ما طابَ لَكُمْ مِـــنَ النِّسَـــاءِ﴾ و، فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: "لا ترهب في الإسلام" و "تناكحوا تكثروا فإني أباهي بكم الأمم يوم القيامـــة"دا ناگونجێت، ئەوا وام بە باش زانی داوای ڕوونکردنەوەی ئەمەت لێ بکەم. لەو باوەڕەشدام وەڵامی ئەم پرسیارەم بەوە دەدرێتەوە گەر ڕوونی بکەنەوە کە قوتابیانی نوور - ژن و پیاویان - تا تەمەنێکی دیاریکراو دەبێ هاوسەر نەگرن، لەبەر لێبڕان بۆ خزمەتگوزاریی قورئان و ئیمان لە تەمەنی هەرزەکاریی و هەرەتی لاویدا. بە پێویستی دەزانم ئەمە باس بکەن لەگەڵ دەستنیشان کردنی ئەو تەمەنەی کە قوتابیانی نوور تیایدا دەتوانن ژن بهێنن.

بە هەرحاڵ، چاوەڕوانی وەڵامتان دەکەم، کە ئومێدەوارم - پشت بە خوا - وەڵامێك بێت لەگەڵ حەق و ڕاستیدا یەکاویەك بێت).

ئەمەی سەرەوە لە نامیلکەیەکی بچووکەوە هێنرا کە ساڵی ١٩٥٣ز لە بەغدا دەرچووە.

(وەرگێڕ)

"بۆچی بە پێچەوانەی سوننەتی پیرۆزت کردووە، تا ئێستا ژنت نەهێناوە"؟

وەڵام: نامەکەمان بۆ مامۆستامان خوێندەوە، کە لە سەختترین حاڵەتی نەخۆشیدایە. ئەویش پێی وتین:

ئەگەر لە نەخۆشییەکی ئاوا سەختدا نەبوومایە، وەڵامێکی دوور و درێژم بۆ ئەو برا بەرێز و خۆشەویستانەم دەنووسی. بەڵام باری ناهەمواری تەندروستیم بواری ئەوەم نادات..

کەواتە بەوپەڕی کورتی و، لە چەند خاڵێکدا، بۆ ئەو برا باش و دڵسۆزانە و، هاوڕێیانم لە خزمەتگوزاریی قورئاندا، بنووسن:

یەکەم:

لەو کاتەدا کە دەبێ بۆ بەرەنگاری کردنی هێرشی ئەو ئیلحادە سامناکەی ماوەی چل ساڵە پەلاماری ئیمان دەدات، چەندین فیداکاری وا هەبن هەرچییەکیان هەیە بەختی بکەن، بڕیارم دا کە نەك تەنها بەختەوەریی دنیام بەڵکو گەر پێویست بێت بەختەوەریی دواڕۆژیشم لە پێناوی حەقیقەتی قورئانی پیرۆزدا بەخت بکەم.

جا لەبەر ئەوەی بتوانم بە تەواوی و بە ئیخلاسی ڕاستەقینەوە بۆ خزمەتی قورئان لێ ببڕێم، ناچار بووم واز لە ژن هێنانی کاتیی دنیا بهێنم - کە دەزانم سوننەتێکی پیرۆزی پێغەمبەرە ﷺ - تەنانەت گەر لەم دنیایەدا (دە) دانە "حور العين"ی بەهەشتیشم بدەنێ، هەر خۆم بە ناچار دەزانم واز لە هەموویان بهێنم، لە پێناوی ئەو ڕاستییە(ڕاستیی قورئان)دا.

چونکە ئەو ڕێکخراوە سامناکانەی مولحیدان چەندین هێرشی سەرومڕ و توندوتیژ بۆ سەر ئەو ڕاستییە دەبەن و، چەندەها پیلانی چەپەڵیشی لە دژ ساز دەکەن. کەواتە ئەوپەڕی خۆبەخت کردن و فیداکاری بۆ بەربەستی ئەو

هەوڵەی ئەوان پێویستە و، دەبێ هەر کارێك کە بۆ بڵاوکردنەوەی ئایین ئەنجام دەدرێت خاوێن و بێگەرد و، تەنها بۆ ڕەزامەندیی خوای گەورە بێت، بێ ئەوەی هۆیەك بێت بۆ هیچ شتێکی تر.

چەندەها زانای نەگبەت و کەسانی خواناس لە ئەنجامی خەمی ژیان و گوزەرانی خێزان و منداڵیان، فەتوایان بۆ بیدعەت دەرکرد، تەنانەت لە شێوەی پشتگیریی بیدعەت خوازانیشدا دەرکەوتن!

لەبەر ئەمە و لە بەرامبەر ئەو هێرشە سامناك و سەختەی دەکرێتە سەر ئایین، دەبێ پێویست نەبوون بە خەڵکی و بەڵکو بە هەموو شتێك، ئەنجام بدرێت. بە تایبەت دوای ماوە نەدان و نەهێشتنی وتنەوەی وانەی "ئایین" لە قوتابخانەکاندا و، گۆڕینی بانگی شەرعی.

لەبەر ئەوە، دەستم لە ژن هێنان هەڵگرت، کە دەزانم "سوننەت"ێکی پێغەمبەرە ﷺ، بۆ ئەوەی تووشی "حەرام" نەبم و، بتوانم زۆر "واجب" و "فەرز"ی ئەستۆم جێ بەجێ بکەم. چونکە ناکرێت لەبەر بەجێهێنانی "سوننەت"ێك مرۆڤ دووچاری چەندین کرداری "حەرام" ببێت.

زانای زۆر هەبوون کە لە ماوەی ئەم چل ساڵەدا ئەم سوننەتەیان بەجێ هێنا، بەڵام ناچاریش بوون تووشی (دە) گوناهی کەبیرە و حەرام ببن و، واز لە بەشێکی فەرز و سوننەتەکان بهێنن!

**دووهەم:**

ئایەتی پیرۆزی: ﴿فانکِحُوا ما طابَ لکم...﴾ (النساء:٣) و، فەرموودەی پیرۆزی: "تناکحوا تکاثروا"[١]، هەروەها فەرمانەکانی تری هاوچەشنیان،

---

(١) تناكحوا تناسلوا فإني أباهي بكم الأمم يوم القيامة. رواه عبدالرزاق والبيهقي عن سعيد بن أبي هلال مرسلاً بلفظ: (تناكحوا تكثروا فإني أباهي بكم الأمم يوم القيامة). قال في المقاصد: جاء معناه عن جماعة من الصحابة، فأخرج أبو داود والنسائي والبيهقي وغيرهم عن معقل بن يسار مرفوعاً: تزوجوا الولود الودود فإني مكاثر بكم الأمم يوم القيامة، ولأحمد وسعيد بن

فەرمانی "واجب بوون" و هەمیشەیی نین، بەڵکو فەرمانی "سوننەت"ن. جگە لەوەش کە بەندن بە چەند مەرجێکەوە دەبێ بێنەدی. لەوانەیە هەموو ئەو مەرجانە بۆ هەموو کەسێك و لە هەموو کاتێکدا کۆنەبنەوە و نەیەنە دی.

پاشان فەرموودەی پیرۆزی: "لا رهبانية في الاسـلام"[1] ئەوە ناگەیەنێت کە ژن نەهێنان و گۆشەگیری - وەك ئەوەی ڕاهیبەکان - حەرامن و نابێت بن. بەڵکو ئەم فەرموودەیە هاندانە بۆ خەڵکی تاکو لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا بەشدار بن، وەك لە ناوەرۆکی ئەم فەرموودەیەدا هەیە کە دەفەرموێ: "خير الناس أنفعهم للناس"[2]، دەنا هەزاران کەس لە پیاوچاکانی پێشین، بە جۆرێکی کاتی، لە خەڵکی دوور کەوتوونەتەوە و، تا ماوەیەك حەزیان لە گۆشەگیری بووە و، دەستیان لە جوانیی دنیای فانی داشۆردووە و خۆیان لێ داماڵیوە، تاکو بتوانن بە تەواوی و ڕاستی ژیانی دوارۆژی خۆیان بنیات بنێن.

جا مادەم کەسانێکی زۆری پیاوچاکانی پێشین، لەبەر گەیشتن بە کەماڵێکی نەبڕاوە و "تایبەت بە خۆیان" وازیان لە دنیا و هەموو ڕازاوەیی و جوانییەکی هێناوە، ئەوا دەبێ ئەو کەسەی کە بۆ "بەختەوەریی هەمیشەیی و نەبڕاوەی چەندەها لێقەوماو" لێ دەبڕێت و نایەڵێت بکەونە هەڵدێری

---

منصور والطبراني في الأوسط والبيهقي وآخرين عن أنس قال كان رسول الله ﷺ يأمر بالباءة وينهى عن التبتل نهيا شديداً، ويقول: تزوجوا الولود الودود فإني مكاثر بكم الأمم يوم القيامة، وصححه ابن حبان والحاكم.. الخ ( باختصار عن كشف الخفاء للعجلوني ١٠٢١) والسيوطي في الجامع الصغير (٣٣٦٦). (وەرگێڕ - لە چاپی عەرەبیی "اللمعات"ەوە).

(١) قال ابن حجر: لم أره بهذا اللفظ، لكن حديث سعد بن أبي وقاص عند البيهقي: "إن الله أبدَلَنا بالرهبانيةِ الحنيفيةَ السمحةَ". كشف الخفاء: ٣١٥٤

(٢) حديث حسن أخرجه القضاعي في مسند الشهاب وابن عساكر في تاريخ دمشق ٢/٤٢٠/٢ وانظر الصحيحة ٤٢٦ وصحيح الجامع الصغير وزيادته برقم ٦٥٣٨.

گومڕاییەوە و، بۆ بەهێز کردنی ئیمانی ئەوان تێدە کۆشێت لە پێناوی خزمەت کردنی ڕاستەقینەی ئیمان و قورئاندا و، لە بەرامبەر هێرشە ناکامەکانی دەرەوە و شالاوە ئاشکراکانی ناوخۆدا خۆی ڕادەگرێت.. ئەو کەسەی ئەم کارە گشتییە ئەنجام دەدات - نەك کاری تایبەتی بۆ خۆی - ڕەفتاری پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ناکات، بەڵکو بەپێی حەقیقەتی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ هەنگاو دەنێت.

پاشان ئەوپەڕی ئاواتەخوازم کە بە ئەندازەی یەك گەردیلەم لەو فەرمایشتە ڕاستەی صیددیقی مەزن - خوا لێی ڕازی بێت - دەست بکەوێت کە دەفەرموێ:

"با جەستەم لە دۆزەخدا ئەوەندە گەورە ببێت کە ئیتر جێی هیچ ئیماندارێکی تری تێدا نەبێتەوە"!

لەبەر ئەوەیە کە ئەم سەعیدە لاوازە "ژن نەهێنان" و پێویست نەبوونی بە خەڵکی، لە درێژایی ژیانیدا، بۆ خۆی هەڵبژاردووە.

**سێهەم:**

ئێمە بە قوتابیانی نوورمان نەوتووە: "ژن مەهێنن و وازی لێ بهێنن بۆ خەڵکی". ناشبێ پێیان بوترێ..

بەڵام قوتابیان لەناو خۆیاندا چەند پلە و چینێکن، هی وایان هەیە دەبێ تا دەتوانێت، لە ماوەیەکی تەمەنیدا، خۆی بە پێداویستییەکانی دنیاوە نەبەستێت، تاکو بگات بە خۆبەخت کردن و دامەزراویی تەواوەتی و هەرە مەزن. خۆ ئەگەر ئافرەتێکی وەهای لێ هەڵکەوت لە خزمەتگوزاریی ئیمان و قورئاندا یارمەتیی بدات، ئەوە خێرێکە خوا داویەتی. چونکە ئەم چەشنە ژن هێنانە ڕێی کار و خزمەتگوزاریی قورئانی لێ ناگرێت.

سوپاس بۆ خوا، زۆر كەسی وا لەناو قوتابیانی نووردا هەن. هاوسەرەكانیشیان لە خزمەتگوزاریی قورئان و ئیماندا هیچیان لەوان كەمتر نییە. تەنانەت كاتی وا هەیە بە بۆنەی ئەو شەفەقەتە بێ بەرامبەر و بێ پاداشتەی لە سروشتیاندا هەیە، پێش مێردەكانیشیان دەكەون و، بەم پالەوانێتییەی پێیان بەخشراوە و بە ئیخلاسێكی تەواو كارەكانیان ئەنجام دەدەن.

ئنجا زۆربەی قوتابییە پێشینەكانی نوور ژنیان هێناوە و، بە تەواوی و ڕێكوپێكی ئەم سوننەتەیان جێبەجێ كردووە. پەیامەكانی نووریش ڕوو دەكاتە ئەوانە و پێیان دەڵێت:

ماڵەكانتان بكەن بە قوتابخانەیەكی بچووكی نوور و، جێی وەرگرتنی زانست و فێربوونی خواناسی. تاكو ئەو منالآنەی كە بەرهەمی ئەنجامدانی ئەم سوننەتەن، لەسەر ئیمان پەروەردە بن و، لە قیامەتدا شەفاعەتتان بۆ بكەن و، لە دنیاشدا كوڕ و منالْ و جگەرگۆشەی باشتان بن. ئەو كاتە بە تەواوی ئەم سوننەتە پیرۆزەتان تێدا جێبەجێ دەبێت.

دەنا ئەگەر منالەكان لەسەر پەروەردەی ئەوروپایی گەشە بكەن و پێ بگەن – وەك لە ماوەی سی ساڵی ڕابوردوودا ڕووی دا – ئەوا زۆربەی ئەو منالآنە لە لایەكەوە سوودیان بۆ دنیاتان نابێت و، لەو لاشەوە لە قیامەتدا سكالآتان لە دەست دەكەن، چونكە لەوێ پێتان دەڵێن: "بۆچی ئیمانتان نەپاراستین"؟ ئێوەش بەم وتەیەی ئەوان پەژارە و پەشیمانی داتان دەگرێت، كاتێ كە پەشیمانی دادی مرۆڤ نادات و سوودی نابێت. ئەمەش پشتگوێ خستنی ئەو حیكمەتەیە كە لە سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەردایە ﷺ.

# ئاونگی ئومێد و فێنکیی ئیمان

❑ ئومێدی یەکەم:

ئەی ئەو کەسانەی گەشتوونەتە تەمەنی کاملی!
ئەی خوشك و برا ئازیز و بەڕێزە پیرەکانم!
منیش وەکو ئێوە پیرێکی بەساڵاچووم!

دەمەوێت هەندێ لەو حاڵەتانەی کە بەسەرمدا هاتوون و ئەو دەرگایانەی هیوا و ئومێدیش کە لە پیریدا لێم کراونەتەوە، بۆ ئێوەی بەڕێزیان بنووسم. تاکو ئێوەش لەگەڵ خۆمدا لەو دڵدانەوە نوورانی‌یانە بەشدار بکەم کە لەو هیوا و ئومێدانەوە تیشك دەدەن و دەبریسکێنەوە.

گومانی تێدا نی‌یە کە ئەو ڕووناکی‌یانەی من بینیمن و، ئەو دەرگا نوورانی‌یانەش کە لە من کرانەوە، بە گوێرەی توانا و لێهاتنی پەرێشان و ناتەواوی خۆم بوون، پشت بەخوا ئامادەیی پاك و بێگەردی ئێوەی بەڕێز ئەو ڕووناکی‌یەتان جوانتر و درەخشانتر پیشان دەدات و، ئومێد و هیواکانیشتان توندوتۆڵ و بەهێزتر دەخاتە بەردەم.

بێ گومان سەرچاوەی ئەو ڕووناکی‌یانە و، گەنجینەی ئەو هیوا و ئومێدانەی کە لەمەولا باسیان دەکەین، تەنها هەر "ئیمان"ە.

❑ ئومێدی دووهەم:

لە سەرەتای پیریم و لە ڕۆژێکی پایز و دەمی عەسردا، لەسەر لوتکەی چیایەکەوە دەمڕوانی‌یە دنیا. کتوپڕ لە ناخی دەروونمدا هەستم بە حاڵەتێکی یەکجار ناسك و خەماوی و تاریك کرد!

چونکە بینیم: وا مـن بەسالّدا چووم و، ئەمڕۆش پیر بووە و، سالّیش لـە کاملّیدایە و بەرەو پیری دەڕوات. تەنانەت دنیا خۆیشی پیر بووە!

لـە ڕاستیدا ئەم پیری‌یەی کە هەموو شتێکی گرتووەتەوە، بـە تـەواوی ڕایتەکاندم و تەزووی بە هەموو جەستەمدا هێنا. چونکە تێگەیشتم کـە وادەی جودایی دنیا و دووریی یارانی خۆشەویستم لـێ نزیك بووەتەوە!

لـەم کاتەدا کە مـن بەم پەژارە و نائومێدی‌یەوە دەتلامەوە، "میـهرەبانیی خواوەند"م لە ناکاودا لـێ دەرکەوت و، ئەو خەم و خەفەتە زۆر و جودایی ئازاربەخشانەی بۆ گۆڕیـم بـە دڵخۆشـی و شـادمانی و نوورێکـی درەخشـانی ئەوتۆ کە هەموو سووچ و قوژبنێکی دەروونمی ڕووناك کردەوە.

بەڵێ هاوتەمەنە پیرەکانم!

ئەو خواوەندە گەورە و باڵادەستەی کـە لـە سـەد شوێن زیـاتر لـە قورئـانی پیرۆزدا بە سیفەتی "الرحمن الرحیم" خۆیمان پێ دەناسێنێت..

ئـەو خوایـەی کـە هەمیشـە بـەو نیعمەتانـەی دەیانڕێژێتـە سـەر زەوی، میهرەبانی‌یەکەی خۆی دەردەخات و دەینـێرێت بـە هانـا و یارمـەتیی هـەر زیندەوەرێك کە پەنای پێ بردبێت و پێویستی بە سۆز و بەزەیی ئەو بێت..

ئەو میهرەبانەی کە لـە وەرزی بەهاری هەموو ساڵێکدا و لـە جیـهانی پەنـهانی "غـەیب"ەوە دیاریی نیعمەتە زۆر و لـە ژمارە بەدەرەکانی خۆی بـۆ ئێمەی دەست کورت و موحتاجی ڕۆزی و بە گوێرەی پلـەکانی لاوازی و دەستەوسانیمان دەنێرێت و، بەمـەش میهرەبانی‌یـە گشتی‌یەکەی خۆیمـان بـە ڕوونی و درەخشانی بۆ دەردەخات..

سۆز و بەزەیی ئەم بەدیهێنەرە میهرەبانەمان، مەزنترین ئومێـد و گـەورەترین هیوا و ڕووناکترین نووری سەردەمی پیریمانە!

هەست پێ کردن و دەستکەوتنی ئەو میهر و سۆز و بەزەییەش، تەنها بە پەیوەندی بوون دەبێت لەگەڵ ئەو "میهرەبان"ەدا بەهۆی: "ئیمان" و "گوێ ڕایەڵی" و "بەجێهێنانی فەرزەکان"ەوە.

☐ ئومێدی سێهەم:

کاتێ لە بەرەبەیانی پیریدا لە خەوی شەوگاری لاوی بێدار بوومەوە، سەرنجم لە خودی خۆم دا، بینیم وا بە خێرایی لە لوتکەی بەرزاییەکەوە بەرەو دەرگای گۆڕەکەم بەردەبمەوە، وەك "نیازیی میسری"[(١)] لە وەسفی ئەم چەشنە حاڵەتەدا دەڵێت:

لە گەرمەی خەوی غەفڵەتی "گیان"م

ڕووخا بەرد بەردی کۆشکی "ژیان"م!

بەڵێ، ئەو جەستەیەی کە خانە و لانەی گیانمە، بە درێژایی ڕۆژگار یەك لە دوای یەکی بەردەکانی داکەوتن.. ئەو هیوا و ئاواتانەش کە بە توندی منیان بە دنیاوە بەستبوو، هەموویان پچڕان و لەت لەت بوون!

لەمەوە هەستم بە نزیکبوونەوەی وادەی جودایی و لێکدابڕانم کرد لەو هاوڕێ و خۆشەویستانەی کە لەژمارەنایەن.

لەبەر ئەوە، کەوتمە گەڕان بە دوای تیماری ئەم برینە مەعنەوی‌یە قووڵەی کە وا دیارە دەرمانی نی‌یە.

---

(١) نیازیی میسری (١٦١٨-١٦٩٤ز) شاعیرێکی سۆفی‌یە، لە گوندێکی سەر بە پارێزگەی "مەلاتییە"ی تورکیا لە دایك بووە. خوێندنی لە "ئەزهەر" تەواو کردووە، هەر لەبەر ئەوەش پێی وتراوە: "میسری". کە لە میسر گەڕاوەتەوە دەستی کردووە بە ڕێنمایی موسڵمانان لە یەکێك لە قوتابخانەکانی ئەو کاتەی ئەستەمبوڵدا، هەر لەوێش تەریقەتی "خەلوەتی"ی دامەزراندووە کە پێیشی دەوترێت: "تەریقەتی نیازی" و "تەریقەتی میسری". جگە لە "دیوانی شیعر" و "مەکتووبات"ەکەی، چەند بەرهەمێکی تری هەیە وەك: "موائد العرفان"، "عوائد الاحسان"، "هدایة الاخوان". (وەرگێڕ)

بەڵام هیچ چارەسەرێکم دەستگیر نەبوو. لە ناچاریدا منیش وەك "نیازی" وتم:

"دانست" خوازیاری فەنای جەستەمە
"ئەبەد" ئاواتی دڵی خەستەمە
دەروونم کەیلی پەژارە و دەردە
لوقمان سەرسامە و تیمار ئەستەمە

لەم کاتەدا کە من بەم حاڵەوە دەتلامەوە، لە ناکاودا نووری ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەی ﷺ کە ئەمیندار و نموونە و بانگەوازکار و زمانی میهرەبانیی خوای گەورەیە، هاودەم لەگەڵ شەفاعەت و ئەو دیارییەی کە خوای گەورە پێی بەخشیوە و بریتییە لە ڕێنمایی کردنی مرۆڤایەتی، بوون بە مەلهەم و دەرمانێکی سارێژکاری دەردە بێ دەرمانەکەم و، ئەو نائومێدییە ڕەشەیان بۆ گۆڕیم بە ئومێدێکی ڕووناکی درەخشان!

بەڵێ، ئەی خوشك و برایانی پیرم و ئەی ئەوانەی کە وەك من هەست بە پیری دەکەن!

ئێمە کۆچ دەکەین و هیچ ڕێگا چارەیەکی ترمان نییە و، هەرگیز ڕێی مانەوەمان نادرێت. کەواتە هیچ سوودێك لە خۆفریودان و چاونووقاندن وەرناگرین و، دەبێ بەرەو چارەنووسی دیاریکراوی خۆمان بڕۆین.

بەڵام دەبێ بزانین کە هەرگیز جیهانی بەرزەخ وەکو ئەو گومانە تاریکە نییە کە "بێ ئاگایی" پیشانمان دەدات و "گومڕایان" دەیدەن بە گوێماندا..

جیهانی بەرزەخ جیهانی جودایی و شەوەزەنگ نییە. نەخێر، بەڵکو جێی کۆبوونەوەی خۆشەویستان و جیهانی بەدیدار شادبوونەوەی یاران و خۆشەویستانە، کە لە پێشەنگیانەوە پێغەمبەری خۆشەویستی خوا و شەفاعەتکاری ڕۆژی دواییمانە، هەزاران دروودی خوای لەسەر بێت.

بەڵێ، ئەو کەسەی کە بە درێژایی هەزار و سێ سەد و پەنجا ساڵ لە هەموو چەرخێکدا سەرداری سێ سەد و پەنجا ملیۆن کەسە و، پەروەردەکاری گیان و ڕابەری ژیری و خۆشەویستی دڵیانە..

ئەو کەسەی کە بەپێی ناوەرۆکی: "السبب کالفاعل" هەموو ڕۆژێك بە ئەندازەی کردەوەی چاکی ڕۆژانەی نەتەوەکەی "چاکە" دەخرێتە سەر لاپەڕەی کردەوەکانی..

ئەو کەسەی کە خولگەی مەبەستە پەروەردگارییەکان و تەوەرەی ئامانجە گەورە و بەرزەکانی خواوەندە لە گەردووندا..

ئەو کەسەی کە هۆی بەرزبوونەوەی نرخی بوونەوەرە، کە پێغەمبەری سەرداری ئیسلامە ﷺ..

هەروەك لە سەرەتای شەرەفدار بوونی جیهاندا بە پێغەمبەرایەتییەکەی دەیفەرموو: "أمتي.. أمتي"، وەك لە هەندێ "ڕیوایەتی صەحیح" و لە چەندین "کەشفی" ڕاستی پیاوچاکانەوە دەرکەوتووە، هەر ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە ﷺ لە حەشریشدا و لەو کاتەی کە هەرکەسەو لە هەوڵی خۆیدایە و دەڵێت: "نفسي.. نفسي" ئەو بۆ شەفاعەتی نەتەوەکەی لێ دەبڕێت و دەفەرموێ: "أمتي.. أمتي" و، بە گەورەترین و بەرزترین و خاوێنترین بەزەیی و لێبڕانەوە دەکەوێتە هەوڵ و کۆشش بۆ فریاکەوتنی نەتەوەکەی[1].

کەواتە ئێمە - ئەی برایانی پیرم! - بەرەو جیهانێك دەڕۆین کە ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە ﷺ کۆچی بۆ کردووە.. ڕووەو ئەو جیهانە دەگوێزینەوە کە بە نووری ئەو چرا ڕووناکە ﷺ و ڕۆشنایی ئەستێرەکانی دەوروبەری، لە ئەولیا و پیاوچاکە لە ژمارە بەدەرەکان، ڕووناك بووەتەوە.

---

(١) ئیمامی "بوخاری" و "موسلیم" لە ئەبووهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە. (وەرگێڕ)

بەڵێ، هەر تەنها پـەیڕەوی كردنی "سوننەت"ە خـاوێن و پیرۆزەكـانی ئـەم پێغەمبەرە خۆشەویستەیە ﷺ كە مـرۆڤ دەخاتـە ژێـر ئـاڵای شـەفاعەتەكەی و، لەو نوورەی ئەوی بەش دەدات و، لە تاریكیی بەرزەخیش ڕزگاری دەكات.

❐ ئومێدی چوارەم:

كاتێ كە یەكەم هەنگاوم نایە ناو دەرگای پیریی‌یەوە، تەندروستیی جەستەم - كە درێژە بە خەوی "بێ ئاگایی" دەدات - تێكچوو بوو.

بەم جۆرە، "پیری" و "نەخۆشی" یـەكیان گـرت و پێكـەوە هێرشیان كـردە سـەرم و، تـا ئێستایش بـە دوو قۆڵـی لێـم ڕاسـت بوونەتـەوە و زللـەی یـەك لـە دوای یەكم تێ دەسرەوێنن. تا بە تەواوی خەوی "بێ ئاگایی"یان لـێ زڕاندم.

ئنجـا هیـچ شتێكی وەك مـاڵ و منداڵیشـم نـەبوو تـا بـە دنیـاوە بـمبەستنەوە. لەبەر ئەوە، كە سەیری ئەنجامی سەرمایەی تەمـەنی خۆمـم كـرد - كـە بـەهۆی بێ ئاگـایی سـەردەمی لاویـم لـە دەستم دەرچـوو - بینیـم هـەر تەنـها تـاوان و گوناهباریی‌یە!

لەم كاتەدا منیش وەكو "نیازیی میسری" هاوارم لـێ هەڵسا و، وتم:

بە دەسـتی خـاڵی ڕێـگام گـرتـەبەر
بـە بـێ ئاگایـی و ڕەنجـی بێ سـەمەر
لـە كاروان جێمـاو، نـامـۆ و ئـاوارە
سـەرمایەی ژینـم ڕۆیشـت بە هەدەر

* * *

تـەنهـا لافـاوی فـرمێسـكـی چـاوم
قرچەی سـووتاویی تاسـەی هـەناوم
هـاودەمی گەشـتی تەنیایی مـن بوون
سەرباری "ژیری"ی سـەر لـێ‌شێواوم

لەو دەمەشدا لە نامۆییەکی سەختدا دەژیام. بۆیە هەستم بە پەژارە و نائومێدی دەکرد و، لە حەسرەت و پەشیمانیی ڕۆژانی ڕابوردووی تەمەنمدا بووم. لە تاوا بەدەم داد و هاوارەوە داوای یارمەتیم دەکرد و لە دووی ئومێدێکدا دەگەڕام کە دڵم ڕووناك بکاتەوە..

لە ناکاودا "قورئانی پیرۆز"ی خاوەن ئیعجاز ئاوڕی سۆزی لێ دامەوە و، دەستی یارمەتیی بۆ درێژ کردم و دەرگایەکی گەورەی هیوا و ئومێدی بۆ خستمە سەرپشت و، نوورێکی هێندە ئومێدبەخش و درەخشانی پێ بەخشیم کە ئەگەر ئەو نائومێدییەم سەد ئەوەندەش زیاتر و گەورەتر بوایە هەر هەمووی دەڕەواندەوە و دەوروبەرمی بۆ ڕووناك دەکردمەوە.

بەڵێ، ئەی خوشك و برایانی پیری بەڕێزم!

ئەی ئەو کەسانەی کە وەك من هەموو پەیوەندییەکتان لەگەڵ دنیادا پچڕاوە!

ئایا دەگونجێ: "کردگاری شکۆمەند" کە ئەم دنیایەی وەك شارێکی ڕێکوپێك و، چەشنی کۆشك و تەلارێکی ڕازاوە بنیات ناوە، لەگەڵ میوانە ئازیزەکانی ئەم شار و کۆشکەی خۆیدا نەدوێت، یان ڕوویان تێ نەکات؟

خۆ مادەم خوای گەورە ئەم کۆشکەی بە زانیاریی خۆی بنیات ناوە و بە ویستی خۆیشی ڕێکی خستووە و ڕازاندوویەتیەوە، ئەوا دەبێ لەگەڵ دانیشتووانیدا بدوێت، چونکە هەروەك "وەستا زانایە" بە هەمان جۆر "زاناش گۆیایە"!

ئنجا مادەم ئەم کۆشکەی کردووە بە میوانخانەیەکی ڕەنگین و ئەم شارەش بە مەڵبەندێکی جوانی بازرگانی، ئەوا دەبێ هەر ئەو خوایە نامە و پرۆگرامی دانابێت بۆ ڕوونکردنەوەی داخوازییەکانی و جۆری پەیوەندییەکانی لەگەڵماندا.

گومان لەوەشدا نی‌یە کە پەسەندترین و ڕێکترینی ئەو نامە و کتێبانەی ناردوونی تەنها "قورئانی پیرۆز"ی خاوەن ئیعجازە کە بە چل شێوە ئیعجازەکەی چەسپاوە و سەلمێنراوە و[1]، بە لایَ کەمەوە لە هەموو خولەکێکدا بەسەر زاری سەد ملیۆن کەسەوە دەخوێنرێتەوە و، ڕووناکی پەخش دەکات و، ڕێی ڕاست پیشانی خەڵکی دەدات و، لە بەرامبەر خوێندنەوەی هەر پیتێکیەوە بە لای کەمەوە (دە) دانە چاکە و، لە هەندێ کاتدا (دە هەزار) و تەنانەت (سی هەزار) - وەك لە شەوی "قەدر"دا - بۆ خوێنەرەکەی دەنووسرێت.

بەم جۆرە "قورئانی پیرۆز" هەر لەم دنیایەدا بەروبوومی بەهەشت و ڕووناکیی بەرزەخمان پێ دەبەخشێت.

جا ئایا لە هەموو گەردووندا هیچ کتێبێك هەیە بەربەرەکانێی ئەم پلەیەی قورئان بکات و هیچ کەسێکیش هەیە بتوانێت ئەم لافە لێ بدات!

کەواتە مادەم ئەم قورئانە پیرۆزەی کە لە بەردەستماندایە "گوفتاری پەروەردگاری هەموو جیهانەکان"ە و.. فەرمانەکانی ئەون بە ئێمە ڕاگەیەنراون و.. سەرچاوەی میهرەبانی‌یە فراوانەکەیەتی کە هەموو شتێکی گرتووەتەوە و.. قورئانێکە لە ڕوانگەی ڕەهایی پەروەردگارێتی و گەورەیی خوایەتی و فراوانی و گشتگیریی میهرەبانیی بەدیهێنەری شکۆمەندی ئاسمانەکان و زەوی‌یەوە سەرچاوەی گرتووە..

مادەم وایە، ئەوا هەتا دەتوانیت دەستی پێوە بگرە و بەری مەدە. چونکە دەرمانی هەموو دەرد و ڕۆشنایی هەموو تاریکی و هیوای هەموو نائومێدی‌یەك تەنها لەودایە.

---

(١) نووسەر لێرەدا ئاماژە بۆ پەیامی "موعجیزاتی قورئانی" دەکات کە وتەی بیست و پێنجەمی پەیامەکانی نوورە. (وەرگێڕ)

کلیلی دەرگای ئەم گەنجینە هەمیشەییەش بریتی‌یە لە: ئیمان و، تەسلیم بوون و، گوێ بیستی و ملکەچ بوون بۆ فەرمانەکانی و، لەزەت چەشتن لە خوێندنەوەی.

❐ ئومێدی پێنجەم:

لە سەرەتای پیریمدا حەزم لە گۆشەگیری و تەنیایی دەکرد لە سەر گردی "یووشەع"، کە بەسەر گەرووی "بسفۆڕ"دا دەڕوانێت و، "گیان"یشم بە دوای ئاسوودەیی گۆشەگیری و تەنیاییدا عەودالْ بوو..

ڕۆژێکیان لەسەر لوتکەی ئەو گردە ناوبراوە بەرزەوە سەیری ئاسۆکانی دنیام دەکرد.

لە ناکاودا هەڕەشەی "پیری" تابلۆیەکی ناسك و خەمناکی جودایی و نەمانی پیشاندام!

کە سەرنجی ئەو تابلۆیەم دا، بینیم هەر لە چڵەپۆپەی لقی چڵ و پێنجەمی درەختی ساڵەکانی تەمەنمەوە تا قووڵترین ڕەگ و ڕیشەی چینەکانی ژێرەوەی ژیانم، هەموویانم بە تەرمی ئەو دۆست و خۆشەویستانەم دەهاتە پێش چاو کە لە ژمارە نایەن و ئەوانەش کە لە ماوەی ژیانمدا پەیوەندیم لەگەڵیاندا بووە!

لە ناو حەسرەت و پەژارەی جودایی یاران و خۆشەویستاندا، ئەم ناڵەیەی "فزوولیی بەغدادی"م[1] لەبەر خۆمەوە وتەوە کە لە دەمی جودایی خۆشەویستانیدا وتویەتی:

---

(١) "فزوولیی بەغدادی" شاعیرێکی تورکە لە سەدەی شازدەهەمی زایینیدا ژیاوە و، ناوی "محەممەد"ە، ئەم شاعیرە دەورێکی کاریگەری بووە لە ئەدەبی تورکیدا و، بە دامەزرێنەری ئەدەبی ئازەریی تورکی دادەنرێت. بە زمانەکانی: تورکی و فارسی و عەرەبی شیعری وتووە. چەند بەرهەمێکی هەیە یەکێك لەوانە: "لەیلا و مەجنوون"ە، لە ساڵی ١٥٥٥زدا بە تاعوون کۆچی دوایی کردووە. (وەرگێڕ)

لەگەڵ یادی وەسڵی تۆدا
فرمێسکی گەش دەبارێنم
تا هەناسەی ژینم مابێت
بە یادی تۆ دەناڵێنم!

لە ناوەندی ئەو هەموو خەفەت و حەسرەتە قووڵانەدا بە دوای دەروویەکی ئومێد و کلاورۆژنەیەکی ڕووناکیدا دەگەڕام کە دڵی خۆمی پێ بدەمەوە. لەپڕ نووری "ئیمان بە ڕۆژی دوایی" هات بە هانامەوە!

بەڵێ، ئەم ئیمانە نوورێکی ئەوتۆی پێ بەخشیم کە هەرگیز کوژانەوەی نییە و، ئومێدێکیشی خەڵات کردم کە هەرگیز خامۆش نابێت.

بەڵێ خوشك و برا پیرەکانم!

مادەم "ڕۆژی دوایی" هەیە و هەمیشەییە و لە دنیا جوانترە..

مادەم ئەو خوایەی کە ئێمەی بەدی هێناوە خوایەکی دانا و میهرەبانە..

ئەوا دەبێ سکاڵا لە دەست پیری نەکەین و لێیشی بێزار و وەڕس نەبین. چونکە ئەو پیرییەی کە ئاوێتەی "ئیمان" و "پەرستش"ە و مرۆڤ کامڵ دەکات، نیشانەی کۆتایی هاتنی فەرمانبەریتی و ئەرکەکانی ژیان و کۆچکردنی مرۆڤە بەرەو جیهانی پڕ لە میهرەبانی، بۆ پشوودان و حەوانەوە. کەواتە دەبێ زۆر پێی ڕازی بین و تەنانەت مایەی خۆشحاڵیمان بێت!

بەڵێ، سەد و بیست و چوار هەزار لە مرۆڤە هەڵبژاردەکانی گرۆی ئادەمیزاد کە پێغەمبەرانن - دروودی خوایان لەسەر بێت - (بەپێی دەقی فەرموودەی پێغەمبەرﷺ)[1] کە هەندێکیان پشت بە "شهود" دەبەستن و

---

(١) عن أبي أمامة، قال أبو ذر: "قلت: يا رسول الله كم وفاء عدة الأنبياء؟ قال: مائة ألف وأربعة وعشرون ألفاً، الرسل من ذلك ثلاثمائة وخمسة عشر جماً غفيراً". رواه الإمام أحمد (مشكاة المصابيح ١٢٢/٣ ت ٥٧٣٧ قال المحقق: حديث صحيح) وانظر زاد المعاد المحقق ٤٣/١. (وەرگێڕ)

هەندێکی تریشیان لە ڕوانگەی "حق الیقین"ەوە دەدوێن.. هەموو ئەوانە، بە گشتی و یەکدەنگ هەواڵی بوونی ڕۆژی قیامەتمان دەدەنێ و ڕایدەگەیەنن کە:

سەرجەمی خەڵکی دەدرێنە بەر بۆ ئەو ڕۆژەو، خوای باڵادەست هەروەك بەڵێنی داوە بە بێ گومانیش ڕۆژی دوایی دەهێنێتە کایەوە..

ئنجا ئەم مژدە و هەواڵەی کە ئەو پێغەمبەرە سەروەرانە - درووودیان لەسەر بێت - ڕایانگەیاند، سەد و بیست و چوار ملیۆن ئەولیاش بە "کەشف" و "شهوود" و "علم الیقین" بینیویانەو، ڕاستییەکەیان دەرخستووەو، شایەتییان لەسەر داوە. ئەم شایەتیدانەشیان بەڵگەیەکی گومانبڕی بەهێزە لەسەر بوونی "ڕۆژی دوایی"..

هەروەها درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی بەدیهێنەری گەردوون، کە بە سەرانسەری جیهانەوە دیار و درەخشانن، داخوازی بوونی جیهانێکی هەمیشەیین و بەڵگەیەکی ئاشکرای ڕۆژی دواین..

بەڵگەیەکی تری ڕۆژی دوایی، ئەو "توانا ئەزەلی" و "دانستە ڕەها ئەبەدی"یەی خوای گەورەیە کە هەموو ساڵێك لە وەرزی بەهاردا بە فەرمانی "کن، فیکون" تەرمی ئەو درەختە لە ژمارە بەدەرە وشك و مردووانەی سەر ڕووی زەوی زیندوو دەکاتەوەو، دەیانکات بە نیشانە و بەڵگەی: "زیندووبوونەوەی پاش مردن".. هەروەها سێ سەد هەزار جۆر لە زیندەوەر و ڕووەك زیندوو دەکاتەوە، بەمەش سەدان هەزار نموونەی حەشر و نەشر و بەڵگەی ئاخیرەتمان بۆ دەردەخات..

هەروەها ئەو "میهرەبانی"یە فراوانەی خوای گەورە کە درێژە بە ژیانی ئەو گیاندارانە دەدات پێویستیان بە ڕۆزییەو، بە کەماڵی میهرەبانی و بە شێوەیەکی تابلێی دەراسا دەیانژیێنێت.. هەروەها ئەو "چاودێری"یە

بەردەوامەی خواوەندیش کە لە ماوەیەکی کەم و وەختێکی کورتی وەك وەرزی بەهاردا چەندەها جۆر جوانی و ئارایشتکاریی لەژمارەبەدەر و هەمەڕەنگمان پیشان دەدات. بێ گومان ئەم "میهرەبانی" و "چاودێری"یە، بە چەشنێکی بەڵگەنەویست، داخوازی "بوونی ڕۆژی دوایی"ن..

هەروەها "ئەوینی مانەوە" و، "تاسەی هەتاهەتایی" و، "ئاواتە هەمیشەییەکان" کە لە مرۆڤدا ڕەگیان داکوتاوە و بە تەواوی جێی خۆیان لە ناخی ئەم مرۆڤەدا کردووەتەوە، کە ڕێکوپێکترین بەروبوومی ئەم بوونەوەر و گەردوونەیە و، خۆشەویستترین بەدیهاتووی بەدیهێنەریەتی و، پەیوەندییەکی فراوانی لەگەڵ سەرجەمی بوونەوەرانی گەردووندا هەیە.

بێ گومان ئەم تاسە و ئەوین و ئاواتانە، ئاماژە بۆ بوونی جیهانێکی هەمیشەیی پاش ئەم جیهانە بڕاوەیە دەکەن و، بەڵگەی بوونی ڕۆژی دوایی و خانەی بەختەوەریی هەمیشەیین.

هەموو ئەو بەڵگانەی کە باس کران، تا ڕادەی باوەڕ پێ کردن و بە ئەندازەی ئاشکرایی و بەڵگەنەویستیی بوونی ئەم جیهانە بینراوە، بوونی "ڕۆژی دوایی" دەچەسپێنن و ئاشکرای دەکەن[1].

---

(١) ئاسانیی چەسپاندنی هەواڵێکی "ئیجابی" و دژواریی "نەفی" کردنیشی لەم نموونەیەوە دەردەکەوێت:
ئەگەر یەکێك وتی: (لە سەر زەویدا باخچەیەك هەیە بەروبوومەکانی وەك قوتووی شیر وایە)! یەکێکی تریش لە بەرپەرچیدا وتی: (شتی وا نییە)! ئەوا یەکەمیان دەتوانێت تەنها بە پیشاندانی جێی ئەو باخچەیە، یان بە پیشاندانی هەندێ لە بەروبوومەکەی، قسەکەی بە ئاسانی بچەسپێنێت. بەڵام دووهەمیان دەبێ هەموو سەرزەوی بگەڕێت و بیپشکنێت و، بەمەش بیچەسپێنێت کە باخچەی وا نییە! (دیارە ئەمەش کارێکی ئاسان نییە)..
هەروەها سەبارەت بەوانەش کە هەواڵی بوونی ڕۆژی دوایی و بەهەشتمان دەدەنێ، هەزاران بەڵگە و بەروبووم و ئەنجامی ئەو بەهەشتەمان پیشان دەدەن، لە کاتێکدا کە دوو شایەتی ڕاستگۆ سەروزیادە بۆ سەلماندنی قسەکەیان. بەڵام ئەوانەی کە ئەمە ناسەلمێنن، دەبێ ئەم بوونەوەر و زەمانە

جا مادەم وانەی "ئیمـان بە ڕۆژی دوایی" گرنگترین وانەیە کـە قورئـانی پیرۆز بە ئێمەی دەڵێتەوە و، ئەم ئیمانەش بەم چەشـنە و تـا ئـەم ڕادەیـە جێگیر و دامـەزراوە و، خـاوەنی بەڵگـەی ئـاوا بـەرز و توندوتۆڵـە.. ئنجـا ئـەو نـوور و ئومێد و دڵدانەوانەش کـە لـە ئیمـاندان هێنـدە بـەهێزن کـە ئەگـەر سـەد هـەزار "پیری" لە یەك کەسدا کۆببنەوە، هـەر سـەروزیادی پێ بەخشینی دڵنـەوایی و ڕووناك کردنەوەی هەموویان دەبێت..

ئەوا دەبێ ئێمـەی پیری بەسـاڵاچـوو بە پیرییەکەمـان دڵخـۆش و شـادمان بین و، هەمیشە بڵێین:

"الحــمد لله علی کمال الإیمان".

❑ ئومێدی شەشەم:

ئەو دەمەی لە شوێنی دوورخرانەوەم - کە دیلییەکی ئازاربەخش بـوو - بە تـەنیایی لەسـەر لوتکـەی چیـای "چام" دەژیـام، کـە بـە سـەر سـەوزەڵانیی "بـارلا"دا دەڕوانێـت.. لـەو تـەنیایی و گۆشـەگیرییەدا بـە شـوێن نوورێکـدا دەگەڕام کە دڵم ڕووناك بکاتەوە.

شـەوێکیان لــەو ژووره بچکۆلــە سـەرنەگیراوە دانیشـتبووم کـە لەسـەر درەختێکی سنەوبەری سەر لوتکەی ئەو چیایە (بە تەختە) دروست کرابوو..

کتوپڕ پیرییەکەم چەندین جۆری غـەریبیی خستە پێش چـاوی هەسـت و شعوورم، وەك ئـەوەی کـە لـە مەکتووبی شەشـەمدا بـە ڕوونـی بـاس کـراوە. چونکە لە هێمنـی و کپیی ئـەو شـەوەدا جگـە لـە زایەڵـەی خـەمناکی خشـەی

---

بەکجار فراوانە بپشکنن و هـەموویان بگـەڕێن، ئـەوجا گـەر بەهەشتیان نەدۆزییـەوە، دەتوانـن قسەکەیان بە بەڵگەوە بچەسپێنن!

جا براایانی پیرم! فەرموون سەیری گەورەیی هێزی "ئیمان بە ڕۆژی دوایی" بکەن و، بزانن چـەندە پاڵپشتێکی پتەوی دامەزراوی چەسپاوە! (دانەر)

گەڵای دارەکان هیچ دەنگێکی تری تێدا نەدەبیسترا. هەستم کرد ئەو زایەڵەیە سەرجەمی هەست و نەستەکانم و نـاخی پیری و غـەریبیمی پێکـا و، بـە گوێـی دڵمدا چرپاندی و وتی:

(هەروەك ڕۆژی ڕووناك بوو بەم گۆڕە تاریکە و دنیا کفنی ڕەشـی پۆشـی، ڕۆژگاری تەمەنیشت - بە هەمان جۆر - شەوی بەسەردا دێت و، ڕۆژگـاری دنیاش دەگۆڕێت بە شەوگاری بـەرزەخ و، ڕۆژی هـاوینی ژیـانیش دەبێـت بـە شەوی زستانی مردن)!

"دەروون"یشم بە خەفەتەوە لە وەڵامدا وتی:

(ڕاستە، من لێرەدا نامۆ و دوور لە شار و نیشتمانی خۆمم. بـەڵام جودایـی خۆشەویستانی درێژایی تەمەنم کە لە پەنجا ساڵ تێپەڕ بووە و لە فرمێسك ڕشتن بـە دوایـاندا هیچـی تـر شـك نابـەم، نامۆییـەکی گەلـێ دژوارتـرە لـە نـامۆیی نیشتمان. تەنانەت ئەم شەو من هەست بـە غەریبیـەك دەکـەم کـە ئازارەکـەی گەلـێ زیاترە لەچاو غـەریبیی سـەر لوتکـەی ئـەم چیایـە کـە ئەویش پۆشـاکی نـامۆیی وخەفـەتی پۆشیوە! چونکـە "پیری" هەڕەشـەی نزیکبوونـەوەی کـاتی جودایی تەواوەتی و کۆچی دوایی لەم دنیایە لـێ دەکات).

لەتاوا، هەر لە نـاوەندی ئـەم نامۆییـەی کـە خەفـەت گـەمارۆی داوە و ئـەم خەفەتەش کە ئاوێتەی ئـازارە، بـە دوای تروسـکاییەکی نـوور و دەرگایـەکی هیوا و ئومێددا دەگەڕام..

لە ناکاودا "ئیمان بـە خـوا" هـات بـە فریامـەوە و دەسـتی گـرتم و، لـە پـاش هەستکردن بەو غەریبیـیە، ئاسـوودەیی و دڵنەواییـەکی گـەورەی ئـەوتۆی پـێ بەخشیم کە ئەگەر ئەو ئازار و نامۆییەم چەندان جار لەوەش زیـاتر بوایـە هـەر دەیڕەواندنەوە و ئاسوودەیی پێ دەبەخشیم.

بەڵێ خوشك و برایانی پیرم!

مادەم بەدیهێنەرێکی میهرەبانمان هەیە، ئەوا ئیتر ئێمە غەریب و نامۆ نین.. مادەم خوای گەورە هەیە، ئەوا ئێمە هەموو شتێکمان هەیە.. مادەم خوا و فریشتەکانی هەن، ئەوا ئەم دنیایە چۆڵ نی‌یە و، ئەم بیابان و هەردانەش کە بە چۆڵ دێنە بەرچاومان، لە ڕاستیدا پڕن لە مەلائیکەت و بەندە بەڕێزەکانی خوای گەورە.

بەڵێ، نووری ئیمان بەو خوایە و، ڕوانینە دنیا لەبەر خوای گەورە و لە ڕوانگەی ئەو ئیمانەوە، هەرچی درەخت و دار و بەرد هەیە، هاودەم لەگەڵ بەندە خاوەن هەست و شعوورەکانی، هەموویان دەکات بە خەمڕەوێن و هاوەڵ و ئاشنامان. چونکە دەگونجێ ئەو بوونەوەرانە بە زمانی حاڵیان لەگەڵماندا بدوێن و، دڵمان بدەنەوە و، بێ تاقەتیمان دەربکەن.

بەڵێ، بە ئەندازەی سەرجەمی بوونەوەرانی گەردوون و بە ژمارەی پیتەکانی کتێبی ئەم جیهانە گەورەیە، بەڵگە لەسەر "بوونی خوای گەورە" هەیە.

هەروەها بە ئەندازەی هەموو ئامێرەکانی سەرجەمی گیانداران و ژمارەی ئەو خۆراك و نیعمەتانەش کە بە تایبەتی پێی بەخشیون و، تەوەرەی ڕەحمەت و میهرەبانی و چاودێریی خوای گەورەن، بەڵگە بە دەستەوە هەیە کە هەر هەموویان ڕێنماییمان دەکەن و، دەمانگەیەننە دەرگای بەدیهێنەری بەخشندە و میهرەبان و پارێزەری خۆشەویستمان.

گومانیش لەوەدا نی‌یە کە چاکترین و گیراترین تکاکار لەو دەرگانەیەدا: "دەستەوسانی" و "لاوازی"ن کە لە سەردەمی پیریماندا پەیدا دەبن و سەرهەڵدەدەن.

کەواتە لە بریی ئەوەی پشت لە پیری هەڵبکەین، دەبێ خۆشمان بوێت و ڕێزی بزانین. چونکە شەفاعەتکارێکی جێی ئومێدە لەو دەرگانە بەرزەی خواوەندا.

□ ئومێدی حەوتەم:

کاتێ کە لە سەرەتای پیریمدا خەندەی خۆشحاڵیی "سەعیدی کۆن" نەما و، جێی بۆ شین و گریانی "سەعیدی نوێ" چۆڵ کرد، دنیاخوازانی "ئەنقەرە" پێیان وابوو من وەك باری پێشووم ماومەتەوە و هەر "سەعیدی کۆن"ی جارانم. بۆیە بانگهێشتیان بۆ کردم کە بچم بۆ ئەوێ. منیش ڕۆشتم(١).

لە ڕۆژێکی کۆتایی پایزدا ڕۆشتمە سەر لوتکەی قەڵاکەی ئەنقەرە، کە لە من گەلێ زیاتر دووچاری پیری و پرتووکان بووبوو!

لەوێ ئەو قەڵایەم وەك ڕووداوە مێژووییە بەردبووەکان هاتە بەرچاو!

جا بەهۆی پیربوونی ساڵ لە وەرزی پایزدا و، پیریی خۆم و، پیریی قەڵاکە و، پیریی مرۆڤایەتی و، پیریی دەوڵەتی مەزنی عوسمانی و، مردنی خەلافەت و، پیربوونی دنیا بە گشتی، خەمێکی قووڵ، ناخی دەروونمی گرتەوە و تەزوویەکی بەتینیش بە جەستەمدا هات..

ئەو حاڵەتە، ناچاری کردم کە لەسەر لوتکەی ئەو قەڵایەوە چاو بەناو بەرزاییەکانی ئایندە و شیو و دۆڵەکانی ڕابوردوودا بگێڕم و، بە دوای نوور و ئومێد و شتێکی دڵخۆشکەردا بگەڕێم، تاکو شەوەزەنگی چڕ و تاریکی ئەو

---

(١) ئەمەش لە ١٩٢٢/٩/٩دا بووە، لەم سەفەرەی ئەنقەرەدا و لە ڕۆژی ١٩٢٣/١/١٩دا بەیاننامەیەکی گرنگی بۆ ئەنجومەنی نوێنەران (مەجلیسی مەبعووثان) نووسی کە (ژەنەراڵ کازم قەرەبەکر) لە ئەنجومەنەکەدا خوێندیەوە و سەرەتاکەی بەم شێوەیە دەست پێدەکات: (یا أیها المبعوثون! إنكم لمبعوثون ليوم عظيم)! لە ئەنجامی خوێندنەوەی ئەم وتارەدا نزیکەی (شەست نوێنەر) ڕێگای خواپەرستی و بەجێهێنانی فەرزەکانیان گرتەبەر، پاش ئەوەی ئەو دەوروبەرەی کە لە ئەنقەرەدا تێی کەوتبوون لە سەرچاوەی ئیمان دووری خستبوونەوە. هەر لەم سەفەرەی ئەنقەرەشدا پەیامی (حوباب)ی چاپ کرد، لە بەرامبەر ئەو لە خوا دوورییەی کە لە پەرەسەندن و بڵاوبوونەوەدا بوو. (وەرگێڕ)

بارە ڕۆحی‌یەم بۆ ڕووناك بكاتەوە و، لە تاریكـایی ئـەو هـەموو چەشـنە پیری‌یـە تێك ئالاّوانەی دەورووبەرم، كە نوقمی بووە، دەری بهێنێت[1]!

بۆ مەبەستی چاوگێڕان بە دوای نوور و ئومێددا، ئاوڕێكم بـە لای ڕاسـتدا - كـە ڕابـوردووە - دایـەوە. ئەم لایـەم لـە دوورەوە لـە شـێوەی گۆڕسـتانی باوك و باپیرانم و تێكڕای مرۆڤایەتیدا هاتە پێش چاو. واتە لە بریی ئـەوەی دڵـم بداتەوە و نوورێكم پێ ببەخشێت، كەچی ئەوەندەی تـر بێزاری كـردم و دڵـی داگرتم!

پاشان ئاوڕم بە لای چەپدا دایەوە - كە ئایندەیە - بـەو نیـازەی دەرمـانێكم تێدا دەست بكـەوێت. كـەچی ئـەم لایـەم لـە شـێوەی گۆڕستانێكی گـەورە و تاریكی خۆم و هاوچەشـنەكانم و نـەوەكانی داهـاتوودا بینـی! بـەم جۆرە، ئـەم لایەش دەردەكەی گرانتر كردم!

دوای ئـەوەی كـە دڵـم لـە "ڕابـوردوو" و "ئاینـدە" هەڵكـەندرا، سـەیرێكی كاتی "ئێستا"م كرد. یەكسەر لە بەرچاوی ڕوانینی مێژوویيمدا ئـەم كاتـەم لـە شێوەی تابووتی تەرمی جەستەی تێكشكاوم و، بە وێنەی سەربڕاوێك لە نێوان ژیان و مردندا، هاتە پێش چاو!

كـە دەسـتم لـەم لایـەش داشـۆرد، سـەرم بــەرز كـردەوە و بــۆ چڵەپۆپـەی درەختی تەمەنی خۆمـم ڕوانـی. بینیـم تەنـها یـەك دانـە بـەری گرتـووە، ئـەویش تەرمەكەی خۆمە و بۆم دەڕوانێت!

لەتاوا سـەرم داخسـت و ڕوانیمـە ڕەگ و ڕیشـەی درەختـی تەمـەنم. بینیـم خـاك و گڵـی ژێـر پێـم، تێكـڕا گڵـی جەسـتە و ئێسـكی پرتووكـاوی منن كـە تێكەڵی یەكتری بوون و خەڵكی بەسەریاندا دەڕۆن و پێی پێدا دەنێن!

(١) ئەم حاڵەتە ڕۆحی‌یە لە شێوەی موناجاتدا، بە زمانی فارسی هاتە دڵمەوە و نووسیم، پاشان لە پەیامی (حوباب)دا لە ئەنقەرە چاپ كرا. (دانەر)

بەم شێوەیە، ئەم دوو ڕوانینەش، لە بریی ئەوەی دەرمـانم بدەنێ و زامەکەم سارێژ بکەن، کەچی دەردەکەیان پتر بۆ گران کردم و هیچ دەرمانێکم تیایاندا بەدی نەکردا

لە ناچاریدا ئاوڕێکم بە لای "دوا"وە دایەوە. بینیـم ئەم دنیا فانییە بەرەو شیو و دۆڵـی بێهوودەیی و ڕووەو تاریکستانی "نەبوون" تلێر دەبێتەوە! ئەم سەیرکردنە، ژەهری بەسەر زامەکەمدا کرد و، لـە بریـی ئـەوەی سـارێژ و تیماری بکات پتر کولاندیەوە و هێنایەوە سۆ.

کە لەم لایەش نائومێد بووم، سەیرێکی "بەردەم"ی خۆمـم کـرد و ڕوانیمـە دوور. دەبینم وا گۆڕەکەم لەسەر چەقی ڕێگادایە و دەمی لـێ کردووەمەتەوە و چـاوەڕێم دەکـات! لـــە پشـتیەوە ئـەو ڕێگـا دوور و درێـژە نەبڕاوەیــەش دەردەکەوێت کە چین لە دوای چینی کاروانەکانی گرۆی مرۆڤـی پێدا تێپەڕ دەبن!

منیش لە بەردەم ئەم هەموو گیروگرفتە سەخت و سەرسووڕهێنەرانەی کـە لە هەر شەش لامەوە ڕووم تێدەکەن، بینیم هیچ پاڵپشتێکم نییە کـە پشتی پێ ببەستم و، جگە لە بەشێکی بچووکی ئەو ویستە هەندەکییە(الإرادة الجزئيـــة) نەبێت کە پێم بەخشراوە، هیچ چەکێکی ترم بە دەستەوە نییە.

کەواتە لە بـەردەم هـەموو دوژمنـانی زۆر و شتانی زیانبـەخش و لـە ژمـارە نەهاتوودا تەنها ئەو چەکە مرۆڤانەیە نەبێت کە بریتییە لە (جوزئی ئیختیـاری) هیچی تر شك نابەم.

بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم چەکەش لە خۆیدا کۆڵەوار و ناتەواوە و، نـاتوانێت بڕواتـە نـاو کـاتی "ڕابوردوو" تـاکو خـەم و خەفەتـەکانی ئـەوێم نـەهێڵێت و، بیشـچێتە نـاو "ئاینده"وە تـاکو هـەر شتێکی سـامناك لـە ڕێگامدایە لـەناویان ببات، ئەوا دڵنیا بووم لـەوەی کـە نـە دەستەڵاتی چارەسـەرکردنی سـەرجەمی

ئازارەکانی خۆمم هەیە و، نە دەشتوانم گشت هیوا و ئاواتەکانی ڕابوردوو و داهاتووم بهێنمەدی. بۆیە لە ناچاریدا دەست لەئەژنۆ دانیشتم و دۆش دامام!

لەم کاتەدا کە لە هەر شەش لامەوە چەندین جۆری بێزاری و سەرسامی و نائومێدی و تاریکی دەورەیان دابووم، "نوورەکانی ئیمان"م بینی کە لە ڕووی قورئانی پیرۆزی خاوەن ئیعجازی بەیانەوە دەدرەوشانەوە! ئەم نوورانە بە هانامەوە هاتن و، هەر شەش لاکانیان بە چەندین نووری درەخشان بۆ ڕووناك کردمەوە، بە چەشنێك کە ئەگەر ئەو بێزاری و تاریکییە زۆرانەی گەمارۆیان دابووم سەد جارەش بیوونایەتەوە، ئەو نوورانە سەروزیادی ڕووناککردنەوەی هەموویان دەبوون.

بەم جۆرە، ئەو نوورانەی ئیمان یەك بە یەکی ئەو زنجیرە سامناك و درێژانەیان گۆڕی بە دڵدانەوە و ئومێد و، سەرجەمی مەترسییەکانیشیان کرد بە هیوای گیان و، ئارامی و ئاسوودەیی لە دڵ و دەروونداا

بەڵێ، "ئیمان" توانیی ئەو وێنە سامناکەی "ڕابوردوو" - کە گۆڕستانێکی گەورە بوو - بدڕێنێت و، بیگۆڕێت بە ئەنجومەنێکی نوورانی و کۆگای خۆشەویستان. ئەمەشی بە "عین الیقین" تەنانەت بە "حق الیقین" پیشان دام..

هەروەها ئەو "داهاتوو"ەی کە کاتێ بە چاوی بێ ئاگاییەوە سەیری دەکەین وەکو گۆڕێکی گەورە و فراوان دێتە پێش چاومان، "ئیمان" بە "علم الیقین" پیشانی دام کە لە ڕاستیدا ئەنجومەنی میوانداریی خوای گەورەی میهرەبانە، کە لە کۆشکەکانی بەختیاریی هەمیشەییدا بۆ میوانەکانی خۆی ئامادەی کردووە..

پاشان "ئیمان" ئەو دیمەنی تابووت و تەرمەی کاتی "ئێستا"ی تێکشکاند و، تێیگەیاندم کە کاتی ئێستام مەڵبەندێکی بازرگانییە بۆ دواڕۆژ و میوانخانەیەکی ڕازاوەی خواییە..

ئنجا ئەو تاقانە "بەر"ەی درەختی تەمەن، کە چاوی بێ ئاگایی لە شێوەی "تەرم"دا پیشانی دام، دەرکەوت بەو جۆرە نییە. چونکە "ئیمان" بە "علم الیقین" پیشانی دام کە ئەوە بریتییە لە دەربازبوونی "گیان"م - کە شیاوی ژیانی هەمیشەییە و دەستنیشان کراوی بەختیاریی هەتاهەتایە - لە هێلانە کۆنەکەی خۆی بەرەو ژیانی ناو ئاسۆی ئەستێرەکان و گەشتوگوزار لە ناویاندا..

پاشان ڕازە نهێنییەکانی "ئیمان" دەریانخست کە خاکی ئێسکی پرتووکاوم و خاکی سەرەتای دروستبوونم بەو شێوە کەم نرخە نییە کە پێی پێدا بنرێت، بەڵکو دەرگای میهرەبانیی خوای گەورە و پەردەی سەر ڕووی هۆڵەکانی بەهەشتە..

ئنجا کە یەکەم جار بە چاوی بێ ئاگایی دەمڕوانییە حاڵ و بارودۆخە داڕووخاوەکانی "دنیا" وا دەهاتنە پێش چاوم کە لە شیو و دۆڵی بێهوودەییەوە بکەونە ناو تاریکایی "نەبوون"ەوە. کەچی "ئیمان" پیشانی دام کە ئەم ئاڵوگۆڕانەی دنیا بریتین لە نامە و نووسراوە صەمەدانییەکانی خواوەند و، لاپەڕەکانی نەخشونیگاری ناوە جوانەکانی، کە ئەرکی سەرشانیان ئەنجام داوە و، واتاکانی خۆیان ڕاگەیاندووە و، بەرهەم و ئاکامی خۆیان لە بوونەوەردا بەجێ هێشتووە.

بەم جۆرە "ئیمان" هەتا پلەی "علم الیقین" بەها و چییەتی(ماهیة)ی دنیای پێ ناساندم..

پاشان ئەو "گۆڕ"ەی کە لەوەو پێش وامدەزانی بۆم دەڕوانێت و، لەسەر چەقی ڕێگا لە مەڵاسدایە و چاوەڕوانم دەکات، "ئیمان" بەهۆی نووری "قورئانی پیرۆز"ەوە دەری خست کە ئەو گۆڕە بیرێك نییە دەمی لێ پان

کردبێتمەوە، بەڵکو پیشانی دام کە ئەو گۆڕە لە ڕاستیدا بریتی‌یە لە دەرگای چوونەژوورەوە بۆ ناو "جیهانی ڕووناکی". ئەو ڕێگا دوور و درێژەش بە تاریکایی و نەبوون کۆتایی پێ نایەت، بەڵکو ڕاستە شەقامێکە بەرەو جیهانی "ڕووناکی" و "بوون" و "بەختیاریی هەمیشەیی".

بەم جۆرە.. ئەم حاڵەتانە بوون بە دەرمانی دەرد و مەلهەمی زامەکانم. ئەمانەشم بە شێوەیەکی هێندە ئاشکرا بەدی کرد کە گەیاندمیانە قەناعەتێکی تەواو بەو ئەنجامانە.

پاشان ئەم "جوزئی ئیختیاری"یە کەمەی کە تەنها دەستکەوتێکی تابلێیت هەندەکیی هەیە، "ئیمان" بەڵگەنامەیەکی ئەوتۆی پێ بەخشی کە بەهۆیەوە پاڵ بە توانستێکی ڕەهاوە بداتەوە و، پەیوەندیی بە میهرەبانی‌یەکی فراوانیشەوە بکات لە دژی ئەو هەموو دوژمنە لەژمارەبەدەر و تاریکی‌یە زۆرانەی کە لە هەموو لایەکەوە دەورەیان داوە. تەنانەت هەر خودی "ئیمان" دەبێت بە بڕوانامەیەك بە دەست "جوزئی ئیختیاری"یەوە.

ئنجا هەرچەندەش ئەم جوزئە ئیختیاری‌یە - کە چەکی مرۆڤە - خۆی لە خۆیدا کۆڵەوار و، کەم و، کۆتا و، ناتەواوە، بەڵام ئەگەر بە ناوی خواوەندی حەق و لە پێناوی خوا و لە ڕێگای ئەودا بەکارهێنرا، ئەوا بە ناوی ئیمانەوە بەهەشتێکی هەمیشەیی و فراوان بە پانتایی پێنج سەد ساڵ ڕێ دەستی خاوەنەکەی دەخات..

ئیماندار لەمەدا وەك ئەو سەربازە وایە کە ئەگەر هێزە هەندەکی‌یەکەی خۆی بە ناوی دەوڵەتەوە بەکار بهێنێت، دەتوانێت بە ئاسانی چەند کارێکی ئەوتۆ ئەنجام بدات کە بە هەزاران جار لە هێزە تایبەتی‌یەکەی خۆی گەورەتر بێت.

ئنجا هەروەك "ئیمان" بەڵگەنامەیەك بە دەستی "جوزئی ئیختیاری" دەسپێرێت، لە هەمان کاتدا جڵەوی جوزئی ئیختیاریش لە دەست "جەستە" دەسێنێتەوە کە هیچ دەستەڵاتێکی بەسەر ئاینده وڕابوردوودا نی‌یە و، دەیداتە دەست "دڵ" و "گیان"!

جا لەبەر ئەوەی بازنەی "دڵ" و "گیان" بە وێنەی جەستە پابەندی "کاتی ئێستا" نی‌یە و، چەند ساڵێکی ئاینده وڕابوردووش لە سنووری بازنەی ژیانی دڵ و گیاندان، ئەوا ئەم جوزئە ئیختیاری‌یە لە هەندەکی‌یەوە دەردەچێت و دەبێت بە هەمەکی! ئیتر هەروەك بە "هێزی ئیمان" دەڕواتە ناو قووڵایی شیو و دۆڵەکانی "ڕابوردوو" و تاریکیی خەم و خەفەتەکانی ئەوێ لەناو دەبات، بە هەمان جۆر و بە "نووری ئیمان" سەردەکەوێت و دەفڕێت تا دەگاتە لوتکەی بەرزاییەکانی "ئاینده"ش و هەموو مەترسی‌یەکانی تێدا لەناو دەبات!

بەڵێ، ئەی خوشك و برایانی پیرم و ئەی ئەو کەسانەی کە دەردیسەریی پیری ئازاریان دەدات!

سوپاس بۆ خوا! مادەم ئێمە لە ئیمانداراین و، ئەم ئیمانەش گەنجینەی شیرین و، ڕووناکی و، خۆشەویستیی تا ئەم ڕادەیەی تێدایە..

مادەم ئەم پیری‌یەشمان زیاتر دەستمان دەگرێت و دەمانباتە بەردەرگای ئەو گەنجینانە..

ئەوا دەبێ هەزاران شوکر و ستایش پێشکەش بە خوای گەورە بکەین لەسەر ئەم پیری‌یەی کە ڕووناکیی "ئیمان"ی ئاراستە کراوە!

## پەیامی پۆشتەیی (الحجاب)

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿يا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلابِيبِهِنَّ﴾

تا کۆتایی ئایەتەکە لە سوورەتی: (الأحزاب:٥٩)

ئەم ئایەتە پیرۆزە فەرمان بە شەرمکردن و پۆشتەیی دەدات. بەلاّم ڕای شارستانێتیی ساختە پێچەوانەی ئەم فەرمانە پەروەردگاریيەیە؛ شەرمکردن و پۆشتەیی بۆ ئافرەت بە کارێکی سروشتی نازانێت، بەڵکو بە کۆت و دیلیی دادەنێت بۆیان[1].

---

(١) ئەمە برگەیە کە لەو "لائیحە"یەی پێشکەش بە دادگای "تەمیز" کرا و، لە بەردەمی دادگادا خوێندرایەوە و دادگای بێ دەنگ کرد و، بوو بە پەراوێزی ئەم مەقامە:
(منیش بە دادگای بەڕێزی وەزارەتی دادگەری دەڵێم:
تاوانبارکردنی کەسێك کە بەرز و پیرۆزترین دەستووری خوایی تەفسیر دەکات، ئەو دەستوورەی کە حەقی ڕاستەقینەیە و لە هەموو سەردەمێکدا و لە ماوەی هەزار و سێ سەد و پەنجا ساڵدا سێ سەد و پەنجا ملیۆن موسڵمان لە کاروباری ژیانی کۆمەڵایەتییاندا پرس و ڕایان پێیەتی و ڕەفتاری پێ دەکەن.. ئەو کەسەی کە لە تەفسیرەکەیدا پشت بەو شتانە دەبەستێت کە سێ سەد و پەنجا تەفسیرنووس تیایاندا یەکیان گرتووە و سەلماندوویانە و، شوێن ئەو بیروباوەڕە کەوتووە کە باپیرانی پێشوومان لە ماوەی هەزار و سێ سەد و پەنجا ساڵدا باوەڕیان پێی بووە..
تاوانبارکردنی ئەم تەفسیرنووسە، بڕیارێکی ستەمکارانەیە و، بێ هیچ گومانێك دادگەری - ئەگەر لە ڕووی زەویدا هەبێت - ڕەفزی دەکات و دەست بە ڕووی ئەو بڕیارەوە دەنێت و هەڵی دەوەشێنێتەوە). (دانەر)

وا ئێمەش لە نێوان چەندەها دانایی(حیکمەت) زۆر و زەبەندەدا لەوانەی کە بەڵگەی ئەوەن ئەم فەرمانە پیرۆزەی قورئان سروشتی ئافرەتان داخوازیەتی و، پێچەوانەی ئەم فەرمانەش دژی سروشتیانە، تەنها چوار دانایی باس دەکەین:

○ دانایی یەکەم:

شەرمنی و پۆشتەیی کارێکی سروشتی‌یە بۆ ئافرەتان و سروشتیان داخوازیەتی، چونکە ئافرەت نەرمی و لاوازی تێکەڵی بەدیهاتنیان بووە و، لە دەروونی خۆیاندا هەست دەکەن کە پێویستیان بە پیاوێك هەیە پارێزگاریی خۆیان و منداڵەکانیان بکات، کە لە خۆیان بەلایانەوە ئازیزترن. کەواتە ئافرەتان بە سروشت وا دروست کراون کە لای کەسانی تر خۆیان خۆشەویست بکەن و کارێ نەکەن دوورەپەرێزی و نەفرەتیان لێ بکرێت، یان ڕەزایان لای ئەوان قورس ببێت.

پاشان، نزیکەی حەوت لە دەی ئافرەتان: یان بەساڵاچوون، یان ناشیرینن و حەزناکەن پیری و ناشیرینی‌یان دەربخەن، یان دارای غیرەتێکی توندوتیژن و مەترسیی ئەوەیان هەیە کە خەڵکی جوانەکان زیاتر پەسەند بکەن تا ئەوان، یاخود لەو مەترسی‌یەدان کە دەستدرێژی بکرێتە سەریان و تۆمەتیان بۆ ڕێك بخرێت..

ئەو ئافرەتانە - بە سروشت - حەزیان لە پۆشتەیی و خۆپاراستنە، نەوەك دەستدرێژی‌یان بکرێتە سەر و، تاکو لای مێردەکانیشیان جێی تۆمەت نەبن، تەنانەت بەتەمەنەکانیان پتر سوورن لەسەر خۆداپۆشین.

لەوانەیە تەنها دوو یان سێ لە دەی ئافرەتان جوان و لاو بن و، لە دەرخستنی جوانیی خۆیان وەڕس و بێزار نەبن!

ئاشکرایە کە مرۆڤ لە ڕوانینی ئەوانەی خۆشی ناوێن، بێزار دەبێت. خۆ ئەگەر وا دابنێین ئافرەتێکی جوان حەز بکات دووسێ کەسی نامەحرەم بیبینن، هەر ئەو ئافرەتە - بە بێ گومانی - لە سەیر کردنی حەوت هەشتێکی تری نامەحرەم وەڕس و بێزار دەبێت، بەڵکو نەفرەتیشیان لێ دەکات.

کەواتە ئافرەت، بە مەرجێك ڕەوشتی تێك نەچووبێت، بە بێ گومانی لەدەست ئەو بۆڕوانینە چەپەڵانە هەڵدێت کە وەك تاقی کراوەتەوە کاریگەریی ماددیی چەشنی ژەهریان هەیە. بە ڕادەیەك کە دەبیستین زۆربەی ئافرەتانی ئەورووپاش - کە مەڵبەندی ڕووتی و خۆدەرخستنی ئافرەتە - لەتاو ڕوانینی خەڵکی بۆیان سکاڵا بۆ لای پۆلیس دەبەن و دەڵێن:

ئەو بێ نرخانە لە بەندیخانەی ڕوانینیاندا بەندمان دەکەن!

لەمەی پێشەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە:

ئەم کارەی شارستانێتیی هەرزەیی کردوویەتی و پۆشتەیی لەناودا لابردووە و ڕێی بۆ ڕووتیی ئافرەت واڵا کردووە، کارێکە دژ و پێچەوانەی سروشتی مرۆڤە و، فەرمانەکەی قورئانی پیرۆزیش کە داوای شەرمنی و پۆشتەیی دەکات، سەرەڕای ئەوەی سروشتی ئافرەت داخوازیەتی، لەگەڵ ئەوەشدا ئافرەت لە سووکایەتی و بەدڕەفتاری و زەلیلی و دیلیی مەعنەوی و نزمی دەپارێزێت، ئەو ئافرەتانەی کە سەرچاوەی میهرەبانی و شەفەقەتن و، هاوسەر و هاوڕێیەکی ئەمینی مێردەکانیانن لە دواڕۆژدا.

ئنجا سەرەڕای ئەمانەش، سروشتی ئافرەت مەترسیی لە پیاوانی بیانی تێدایە. جا ئەم مەترسییە داخوازی پاراستن و خۆدەرنەخستنە، چونکە لەوانەیە لەزەتێکی ناڕەوای نۆ دەقیقەیی، ئازاری هەڵگرتنی سکێکی نۆ مانگی و پاشان بەخێوکردنی منداڵێکی بێ کەسی بۆ ماوەی نۆ ساڵی لێ بێتەوە کە ئەو لەزەتە بشێوێنێت.

لەبەر ڕوودانی زۆری ئەم چەشنە گریمانە، ئافرەتان بەپێی سروشتیان ترسێکی ڕاستەقینەیان لە پیاوانی نامەحرەم هەیە و، دوورەپەرێزییان لێ دەکەن.

کەواتە بەدیهاتنی لاوازی ئەوان، بە ڕاستی و تەواوی، بۆ خۆپاراستن بێداریان دەکاتەوە و، بۆ پۆشتەیی هانیان دەدات، تاکو ئارەزووی نامەحرەم نەبزوێت و، ئەم پۆشتەییە نەهێڵێت دەستدرێژی بکرێتە سەریان و، سروشتیان ڕێنماییان دەکات بۆ ئەوەی کە قەڵای مەحکەم و سەنگەری ئەمین و بێ وەی بۆ ئەوان تەنها "پۆشتەیی"یە.

بیستمان کە: ژنی پیاوێکی پلەوپایە بەرزی دنیایی، شوێنە سەرنج ڕاکێشەکانی جەستەی بە دەرەوە بووە و، بۆیاخچییەکی پێڵاویش بە ئاشکرا و ڕۆژی ڕۆشنا و لە ناوجەرگەی ئەنقەرەی پایتەختدا پەلاماری داوە!

جا ئایا ئەم ڕووداوە "نارەوایە" زللەیەکی توندوتیژ نییە لەسەر ڕووی دوژمنانی داوێن پاکی و پۆشتەیی، لەوانەی کە هیچ ئاگایەکیان لە واتا و ناوەرۆکی شەرم و حەیا نییە؟!

○ دانایی دووهەم:

پەیوەندیی بەهێز و، خۆشەویستیی قووڵی نێوان ژن و مێرد تەنها لە پێداویستییە سروشتییەکانی ژیانی دنیایانەوە پەیدا نەبووە، چونکە ئافرەت تەنها لە ژیانی دنیادا هاوەڵی مێردەکەی نییە، بەڵکو لە ژیانی هەمیشەیی و نەمریشدا هاوڕێ و هاوسەریەتی.

جا مادەم ئافرەت هاوڕێی ژیانی هەمیشەیی مێردەکەیەتی، ئەوا نابێت سەرنجی غەیری هاوڕێ هەمیشەییەکەی بۆ لای جوانیی خۆی ڕابکێشێت و، نابێت بەم کارە مێردەکەی بێزار و دووچاری غیرەت و تووڕەیی بکات.

ئنجا لەبەر ئەوەش کە مێردە ئیماندارەکەی - بە بۆنەی ئیمانەکەیەوە - تەنها بۆ ئەم دنیایە ئەوی خۆش ناوێت و خۆشەویستی‌یەکەشی ئاژەڵانە و بۆ تەنها کاتی جوانیی ئەو نی‌یە، بەڵکو خۆشەویستی و ڕێزی هاوسەرەکەی بێگەردن و، تا کاتی پیری و نەمانی جوانی، تەنانەت هەتا ژیانی هەمیشەیی و نەمریش هەر بەردەوامن، ئەوا دەبێت بەرامبەر بەمە ئەو ئافرەتەش جوانیی خۆی تەنها بۆ مێردەکەی دەربخات و، هەر ئەوی خۆش بوێت، چونکە مرۆڤێتیی مرۆڤ داخوازی ئەمەیە. دەنا زۆری لە کیس دەچێت و کەمی دەست دەکەوێت.

پاشان یەکێك لە داخوازی‌یەکانی شەرع: هاوکوفیی مێردە بۆ ژنەکەی. واتە دەبێ وەك یەك و بۆ یەکتر گونجاو بن. گرنگترین لایەنەکانی هاوکوفییش - وەك زانراوە - هاوکوفی‌یە لە ئاییندارییدا.

ئەو مێردە چەندە بەختەوەرە کە ئاییندارییی ژنەکەی دەبینێت و چاوی لێ دەکات و، وەك ئەو دەبێت بە خاوەن ئایین، ئیتر لە ژیانی هەمیشەیی و نەمریدا هاوەڵە بەوەفاکەی لەدەست دەرناچێت.

ئەو ژنەش چەندە بەختەوەرە کە ئاییندارییی مێردەکەی دەبینێت و، دەترسێت لە ژیانی نەمریدا هاوەڵە ئەمینەکەی خۆی لەدەست دەربچێت. لەبەر ئەوە، دەست بە ئیمان و تەقواوە دەگرێت.

"وەیل" و جارێکی تریش "وەیل" بۆ ئەو مێردەی نوقمی نەفامی و هەرزەییەکی ئەوتۆ دەبێت کە هاوسەرە باش و خواناسەکەی لەدەست دەردەکات.

بەدبەختیش بۆ ئەو ئافرەتەی کە چاو لە مێردە خاوەن تەقوا و خواناسەکەی ناکات و، لە ئەنجامدا هاوەڵە بەڕێز و بەختەوەرە هەمیشەییەکەی خۆی لەدەست دەدات.

وەیل و ڕسواییش بۆ ئەو ژن و مێردە بەدبەختانەی کە لە گوناهباری و کرداری ناڕەوادا چاو لە یەکتر دەکەن و، لە پاڵ پێوەنانی یەکتریدا بەرەو ئاگری دۆزەخ پێشبڕکێ دەکەن!

○ دانایی سێهەم:

بەختەوەریی ژیانی خێزان و بەردەوامیی ئەو بەختەوەرییە، بە بەردەوامیی متمانە و باوەڕی چون یەکی نێوان ژن و مێرد و، بەردەوامیی ڕێزی شایان و خۆشەویستیی ڕاستەقینەی نێوانیان دەبێت. بەڵام ڕووت بوونی ئافرەت، ئەو متمانە و ڕێز و خۆشەویستییە چون یەکە تێك دەدات و نایهێڵێت.

لە دەوروبەرێکی ڕووتی وەك ئەمەدا، نۆ لە دەی ئافرەتە ڕووتەکان پیاوی جوانتر لە مێردەکانی خۆیان دەبینن، بەڵام مەگەر تەنها یەکێکیان هیچ کەسێك نەبینێت لە مێردەکەی خۆی جوانتر بێت. پیاوانیش بە هەمان جۆرن؛ مەگەر لە بیست کەسدا یەکێکیان ئافرەتێك ببینێت نەگاتە جوانیی ژنەکەی خۆی، بەڵام ئەوانی تر هەردەم لە ژنانی خۆیان جوانتر دەبینن.

ئەم دەوروبەرە تێکەڵ و ڕووتە لەوانەیە هەستێکی نزم و بێ نرخ و چەپەڵ لە دەرووندا بزوێنێت، جگە لەوەش کە دەبێت بەهۆی ئەوەی ئەو خۆشەویستییە بێگەرد و ڕێزە خاوێنەی باسمان کرد نەمێنێت. چونکە ناگونجێ مرۆڤ - بە سروشت - هەستێکی نزمی ئاژەڵانەی بەرامبەر ئەو ئافرەتە مەحرەمانە تێدابێت کە وەك خوشکی خۆی سەیریان دەکات، چونکە "ڕوخسار"ی کەسانی مەحرەم هەستی بەزەیی و میهرەبانیی سیلەی ڕەحمی کەسوکار دەبزوێنێت.

جا ئەم هەستە بەرزە، مەیل و ئارەزووە شەهوانییەکانی دەروون کەم دەکاتەوە.

بەڵام دەرخستنی شتێك کە دروست نییە دەربخرێت و پیشان بدرێت - وەك قاچ - لەوانەیە لەبەر نەمانی هەست بە مەحرەمیی نێوانیان، هەستێکی نزم لای دەروونە نزمەکان بورووژێنێت، چونکە تەنها "ڕوخسار"ی مەحرەمەکانە کە هەست بە خزمایەتی کردن و مەحرەمێتیی پێوە دیارە و، لەبەر چاودا جیایە لە کەسانی تر، بەڵام دەرخستنی شوێنەکانی تری جەستەی ئافرەت بۆ مەحرەم و نامەحرەم یەکسانە، چونکە هیچ کام لەو نیشانە جوداکەرەوانەی مەحرەمایەتی لەو شوێنانەدا هەستی پێ ناکرێت کە داخوازی سەیر نەکردنی حەرام بێت و، لەوانەیە ئارەزووی ڕوانینی ئاژەڵانە لای هەندێ مەحرەمی بەدخووی ڕەوشت نزم بیزوێنێت!

خۆ ئەم چەشنە ڕوانینە، کەوتنێکی هێندە سامناکە بۆ مرۆڤایەتی کە مرۆڤ لەتاوا تەزوو بە جەستەیدا دێت!

○ دانایی چوارەم:

ئاشکرایە کە "زۆریی وەچە" هەمیشە کارێکی باشە و، هیچ نەتەوە و دەوڵەتێك نییە داوای زۆر کردنی وەچە نەکات. پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی:

"تناكحوا تكثروا فإني أباهي بكم الأمم يوم القيامة"(١).

نەهێشتنی پۆشتەیی و، بواردان بە دەرکەوتن و ڕووتیی ئافرەت، ڕێژەی ژن هێنان کەم دەکاتەوە و بەو پێیە وەچە خستنەوەش گەلێ کەم دەبێتەوە..

چونکە لاو هەرچەندە و بە هەر ئەندازەیەکیش لە ڕێ لادەر و بەدڕەفتار بێت، هێشتا هەر حەز دەکات هاوسەری ژیانی داوێن پاك و پارێزراو بێت و، نایەوێت ڕووت و - وەك خۆی - نزم و سووك بێت. لەبەر ئەوەیە دەیبینیت

---

(١) تەخریجەکەی لە لاپەڕە (٢٧-٢٨)ی ئەم کتێبەدا ڕابورد. (وەرگێڕ)

گەر ئـەو ئافرەتـەی دەسـت نەكـەوێت كـە دەیـەوێت مـارەی بكـات، ئـەوا ژن نەهێنانی پێ باشتر دەبێت و، لەوانەشە لەمەوە سەربكاتە خراپكاری و لـە ڕێ بترازێت.

بەڵام ئافرەت لەمەدا وەك پیاو نییە و ناتوانێت مێرد هەڵبژێرێت.

ئافرەت لەبەر ئەوەی ڕێكخەری كاروباری ناو ماڵە و، پارێزگاریی مـاڵ و منداڵ و هـەموو شتێكی مێردەكـەی خراوەتـە ئەستۆ، ئـەوا گرنگـترین سیفەتی تێدایە كە: ئەمانەت و متمانە پێ بوونە.

بەڵام دەركەوتن و ڕووت بوونی، ئەو ئەمانەتە تێكدەدات و متمانەكەش لە جێی خۆی دەلەقێنێت و، بەم كارە مێردەكەی دووچاری ئازاری مەعنـەوی و دەروونی دەكات.

بە ڕادەیەك "ئازایەتی" و "سەخاوەت" كە دوو ڕەوشتی باشی پیـاون، گـەر لە ئافرەتدا بن، بە ڕەوشتی باش لە قەڵەم نـادرێن. چونكـە ئەگـەر ئـافرەت ئـەو سیفەتانەی تێـدا بێـت، ئـەوا ئەمانـەت و متمانەكـەی تێكدەچێـت بـەوەی كــە ئەنجامەكەی "بێ شەرمی" و "ئیسراف" دەبێت.

جـا مـادەم ئـەركی سەرشـانی پیـاو تەنـها پارێزگـاریی مـاڵ و سـامانی خێزانەكەی نییە، بەڵكو جگە لەوەش پارێزگاری كردنـی ژنەكـەی و بـەزەیی پێدا هاتنەوە و ڕێزلێنانیشیەتی، ئەوا ئەو شتەی لەسەر ژن پێویستە لەسـەر پیـاو پێویست نییە و، ڕێ لە پیاو ناگرێت كە بە ویسـتی خـۆی چ ژنێـك دەهێنێـت دەتوانێت بیهێنێت و، جگە لەو ژنەی هی تریش مارە بكات.

وڵاتـانی ئێمـە وەك وڵاتـانی ئـەورووپا نین و بـە یـەك چـاو تەماشـا نـاكرێن، چونكە لەوێ تا ڕادەیـەك چـەندین هـۆی توندوتیـژی وەك شـەربازی(المبـارزة) هــەن كــە لــە نـاوەندێكی ئـاوا ڕووتـدا پارێزگـاریی شــەرەف و داوێـن پـاكی

دەکەن و، هەر کەسێك بە نیازی چەپەڵ بۆ هاوسەری هەر مرۆڤێکی "بەشەرەف" بڕوانێت، دەبێ لە پێشدا کفنەکەی خۆی بە دەستی خۆی ئامادە بکات! ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە سروشتی ئەوروپاییەکان چەشنی کەشیان ساردوسڕە.

بەڵام جیهانی ئیسلامیی ئێمە لە چاو ئەوروپادا، بە وڵاتە گەرمەکان دادەنرێت. خۆ کاریگەریی ژینگەش لە ڕەوشت و هەڵسوکەوتی مرۆڤدا لای هەموان ئاشکرا و زانراوە.

ڕووتیی ئافرەتیش، کە هەست و ئارەزووی شەهوانیی ئاژەڵانە دەبزوێنێت، لەوانەیە لەو وڵات و خەڵکە ساردوسڕەدا دەستدرێژیی زۆر و خراپکاریی مەزنی لێ نەوەشێتەوە، وەك ئەو ئیسراف و زیادەڕەوییەی کە ئەم ڕووتییە لە وڵاتە گەرمەکان و لەو کەسانەدا بە خێرایی و زوویی دەورووژێن، پەیدای دەکات.

جا خۆدەرخستن و پۆشتە نەبوونی ئافرەتیش کە ئارەزووی دەروون دەورووژێنێت و پەتی هەستە شەهوانییەکان دەپچڕێنێت، لەم چەشنە ناوچانەدا، بە بێ گومانی زیادەڕەوی و ئیسراف و، سنوور شکاندن و، لاوازیی وەچە و، ڕووخانی هەموو هێزێك، بەرهەم دەهێنێت..

چونکە پیاو، کە دەتوانێت لە یەك مانگ یان بیست ڕۆژدا پێویستیی سروشتیی خۆی نەهێڵێت، لەم چەشنە شوێن و دەوروبەرانەدا پێی وایە کە ناچارە هەموو چەند ڕۆژێك جارێ ئەم پێویستییە نەهێڵێت. ئنجا لەبەر ئەوەش کە چەند ڕێگرێکی شەرعیی چەشنی "بێ نوێژی" کە لەوانەیە پازدە ڕۆژ بخایەنێت، نایەڵن ئەو پیاوە توخنی خێزانەکەی بکەوێت، ئەوا ئەو پیاوە گەر بەسەر هەستەکانی خۆیدا زاڵ نەبێت دووچاری داوێن پیسی دەبێت.

پاشان دەبێ دانیشتووانی شار لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا چاو لـە گوندنشـینان نەکەن و، پۆشتەیی نێوانیان لانەدەن. چونکە خەڵکی لادێ خەمی گـوزەران سەرقاڵی کردوون و ناچـارن توانـا و هـێزی جەسـتەیان بـۆ بەدەسـتهێنانی گوزەرانیـان بەکاربـهێنن و، زۆر جـار ئافرەتـان بەشـداریی چـەندین کـار و ئەرکی قورس دەکەن. لەبەر ئەوە، ئەگەر لایەکی لەشـە زبرەکانیـان لـە کـاتی کاردا دەربکەوێت، ئارەزووی ئاژەڵانەی کەسانی تر نابزوێنێت..

جگە لەوەش، بە ئەندازەی شار هەرزە و بێ کـار لـە لادێکـاندا نییـە. ئیـتر خراپکارییەکانی لادێ ناگەنە یەك لە دەی خراپکاریی شار.

لەبەر ئەوەیە کە نابێ شار بە چاوی لادێ سەیر بکرێت.

مەسەلەیەکی گرنگ کتوپڕ بە دڵدا هات:

# ئاشووبی فیتنەسازی ئافرەتان

ئاگاداری‌یەك:

ڕەویەی "پەیامەکانی نوور" بەزەیی و شـــەفەقەت و میهرەبانی‌یـە. هەر لـەبەر ئەوەیە کـە ئـەو ئافرەتانـەی دارای شـەفەقەت و خـاوەنی میهرەبانین پەیوەندییان بەم پەیامانەوە هەیە.

بەڵام ئەم باســە ئاراستەی ئـەو ئافرەتانـە کـراوە کـە بێ هیـچ لێکدانەوەیەك لاسایی ئافرەتانی بیانی دەکەنەوە. لەبەر ئەوە، هـەندێ توندوتیژیی تێدا بەدی دەکرێت، ئەوەش تەنها بۆ بێدارکردنەوەی بێ ئاگایانە.

تکام وایە ئەو خوشکانەی کە ڕابەری شـــەفەقەت و میـهرەبانین، دڵیان لـە توندوتیژیی ئەم باسە گەرد نەگرێت. (دانەر)

لە ڕیوایـەتی فـەرموودەکانی پێغەمبـەرەوە ﷺ دەردەکـەوێ کـە ئافرەتـان و فیتنە و ئاشووبیان لـە ئاخرزەماندا، سامناکترین و مەترسی ترین ڕۆڵ دەبینن.

بەڵـێ، هــەروەك کتێبــەکانی مێـژوو بۆمـان دەگێڕنـــەوە و دەڵێـــن: لـــە سەدەکانی پێشوودا کۆمەڵە ئافرەتێك بە ئازایەتی و چەك هەڵگرتن ناوبانگیان دەرکردووە و، بە "ئافرەتـانی ئـەمازۆن" ناسـراون، تیپێکـی سـەر بـەرزیان لـێ پێکهێنراوە و، لە چەندین جەنگی سەختدا بەشدارییان کردووە..

هەروەك كتێبەكانی مێژوو ئەمەمان بۆ دەگێڕنەوە، بە هەمان جۆر لەم سەردەمەی خۆیشماندا، كە گومڕایی زەندیقێتی بەرەنگاری ئیسلام بووەتەوە و لەگەڵیدا دەجەنگێت، سامناكترین تیپی هێرشبەری ئەوان بۆ سەر ئیسلام، كە بەپێی نەخشەكانی دەروونی بەدخواز كار دەكات و پێشەوایەتی‌یەكەی بە دەستی شەیتان سپێرراوە، دەستەیەك ئافرەتی "پۆشتە و ڕووت"ن كە قاچ و قولیان دەردەخەن و دەیانكەن بە چەكێكی توندوتیژ و، لە دژی ئیمانداران بەكاری دەهێنن..

بەم كارەشیان دەرگای خێزانداری و مارەبڕین دادەخەن و هی داوێن پیسی دەخەنە سەر پشت.. چونكە هانیان دەدەن كە دووچاری تاوانی گەورەیان بكەن و، بە كتوپڕی دەروونی چەندەها كەس دەكەنە دیلی خۆیان و، چەندین زام و برینی بە سۆ و قووڵ لە گیان و دڵیاندا دروست دەكەن. تەنانەت لەوانەیە هەندێ لەو دڵانە وەها بپێكن كە بە جارێ بیانكوژن و لەناویان ببەن.

كەواتە سزایەكی گەلێ دادگەرانەیە كە ئەو قاچ و قولانەی بەو جۆرە چەكی بریندار كەری فیتنەیان لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرتووە، ببن بە سووتەمەنیی دۆزەخ و یەكەم شت دۆزەخ ئەوان بسووتێنێت. چونكە لە ماوەی چەند ساڵێكی كەم و لە بەردەم كەسانێكدا كە لێیان حەرام بوون، ڕووتیان كردوون و دەریانخستوون.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی كە (هەر لە دنیادا) مێردی گونجاویان لە دەست دەچێت، بگرە هەر دەستیشیان ناكەوێت، كە لە ڕاستیدا و بەپێی خواستی سروشتیان گەلێ پێویستیان پێیەتی. بەهۆی ئەوەی كە وەفا و باوەڕیان لە دنیادا لەدەست داوە. بەڵكو لە ئەنجامی گوێ نەدان بە شووكردن و بایەخ

نەدان بە مافەکانی، پشتگوێ دەخرێن و چاودێرییان لە کیس دەچێت، بە چەشنێ کە لە ئەنجامدا چل ئافرەت تەنها یەك پیاو سەپەرشتیکار و بەخێوکەریان دەبێت، وەك فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە[1].

جا مادەم "ڕاستی"بەم چەشنەیە..

مادەم هەموو جوانێك جوانیی خۆی خۆش دەوێت و، بە پێی توانا پارێزگاریی لێ دەکات و نایەوێ بە نیازی خراپ دەستی بۆ ببرێت..

مادەم "جوانی" نیعمەتێکی بەخشراوە و، نیعمەتیش ئەگەر شوکرانەی لەسەر بکرێت، زیاد دەکات و.. گەر ئینکاریش بکرێت، نامێنێ و دەگۆڕێت..

ئەوا بێ هیچ گومانێ ئەو ئافرەتەی خاوەنی ژیری بێت، بە هەموو توانایەکی خۆی هەڵدێت لەوەی کە جوانی‌یەکەی بکات بەهۆی تاوانباری و گوناهکاری و، خەڵکی تریشی پێ بکات بە تەڵەی گوناهباری‌یەوە. هەروەها ڕادەکات لەوەی کە جوانی‌یەکەی ببێت بە ناشیرینی و جوانی‌یەکی زەهراویی شووم و، ئینکاریی ئەو نیعمەتەش بکات کە پێی بەخشراوە و، ئەمەشی بۆ ببێت بە مایەی ئەشکەنجە و ئازار.

کەواتە دەبێ ئافرەتی جوان، جوانی‌یەکەی بە شێوەی ڕەوا بەکاربهێنێت، تاکو جوانی‌یە کاتی و لەناوچووەکەی بۆ ببێت بە جوانی‌یەکی هەمیشەیی و بەردەوام، لە بریی جوانی‌یەکی وا کە چەند ساڵێك زیاتر ناخایەنێت. ئەو کاتەش بەم کارەی، شوکرانەی ئەو نیعمەتەی بەجێ هێناوە.

---

(١) عن أنس قال: لأحدثنكم حديثاً لا يحدثكم أحد بعدي، سمعت رسول الله ﷺ يقول: "من أشراط الساعة أنْ يقلَّ العلمُ ويظهرَ الزنا وتكثرَ النساء ويقلَّ الرجالُ حتى يكونَ لخمسين امرأةً القيِّمُ الواحدُ". رواه البخاری، کتاب العلم، باب رفع العلم وظهور الجهل. (وەرگێڕ)

دەنا لە سەردەمی پیریدا ئەشکەنجە و ئازار دەچێژێت و، لە تاو ئەوەی کە ڕەزای لای خەڵکی قورس دەبێت و پشتگوێی دەخەن، هەتا دەتوانێ دەگری و هەردەم بەدبەختیی خۆی دەلاوێنێتەوە!

بەڵام ئەگەر ئەو جوانی‌یە بە ئارایشتی ئەدەب و ڕەویەی قورئان برازێنێتەوە و، لە چوارچێوەی پەروەردەی ئیسلامیدا چاودێریی شایانی خۆی بکرێت، ئەوا ئەو جوانی‌یە لەناوچووە - لە ڕاستی و حەقیقەتدا - دەبێت بە جوانی‌یەکی هەمیشەیی و لە بەهەشتدا جوانی‌یەکی گەلێ جوانتر و قەشەنگتر لە هی (الحور العین) بەو ئافرەتە دەبەخشرێت. وەك لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ چەسپاوە[٢].

جا ئەگەر ئەو ئافرەتە دارای تۆزقاڵێك ژیری بێت، بە هیچ جۆرێ واز لەم ئەنجامە ڕوون و هەمیشەییە ناهێنێت و بەزایەی نادات.

---

(٢) لەم بارەیەوە فەرموودە زۆرە، ئەمە یەکێکیانە:
عن أم سلمة زوج النبي ﷺ قالت (في حديث طويل): قلتُ يا رسول الله! أنساءُ الدنيا أفضلُ أم الحورُ العين؟ قال: نساءُ الدنيا أفضلُ من الحور العين كفضلِ الظهارة على البطانة. قلت: يا رسول الله! وبِمَ ذالك؟ قال: بصلاتهن وصيامهن وعبادتهن لله عز وجلَّ. ألبسَ اللهُ عز وجلَّ وجوهَهُن النورَ وأجسادَهن الحريرَ. بيض الألوان، خضر الثياب، صفر الحلي.." الخ الحديث.
رواه الطبراني في الكبير والأوسط، وهذا لفظه.
بڕوانە: "الترغيب و الترهيب"٤/٥٣٧. (وەرگێڕ)

مەکتووبی حەوتەم:

# ﴿زَوَّجْنَاكَهَا﴾

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيءٍ إلاّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته أبداً دائماً

برا ئازیزەکانم!

یەکەم: گومڕایانی ئێستا – وەك دووڕووەکانی پێشین – لەو ژن هێنانەی پێغەمبەر ﷺ کە زەینەبی مارە کرد، ڕەخنە و بیانوو دەگرن، چونکە لایان وایە ئەو ژن هێنانە لەسەر بناغەی هاندەری دەروونی و ئارەزوو بووە!

**وەلام:**

نەخێر، هەزار جار نەخێر.. دەستی ئارەزووە نزمەکان گەلێ لەوە کۆتاترە کە بە چمکێکی داوێنی ئەو پلە بەرز و بلندە بگات..

بەڵێ، کەسێ خاوەنی هێندەی گەردیلەیەك ویژدان بێت، دەزانێت پێغەمبەر ﷺ لە تەمەنی پازدە ساڵییەوە تا چل ساڵی، کە تەمەنێکە گەرمیی غەریزەی تێدا قوڵپ دەدات و ئارەزووی دەروونیشی تێدا گڕ دەگرێت، بە شایەتیی دۆست و دوژمنانی، ئەو بە خاوێنی و داوێن پاکیی تەواو ژیاوە و، بە ژنێکی نیمچەپیر – کە حەزرەتی خەدیجەیە، خوای لێ ڕازی بێت – قایل بووە.

کەواتە شتێکی گەلێ ئاشکرا و بەڵگەنەویستە کە فرەژنیی ئەم مەردە بەڕێز و داوێن پاکە لە دوای تەمەنی چل ساڵی، واتە لە کاتی وەستانی گەرمیی غەریزە و ئارەزووەکاندا، هی داخوازیی دەروون نییە، بەڵکو لەسەر چەندین دانایی گرنگ بنیات نراوە، کە ئەمەی خوارەوە یەکێکیانە:

هەموو فەرموودە و کردار و حاڵەت و ڕەفتار و وەستان و جموجووڵەکانی پێغەمبەر ﷺ کانگای ئایین و سەرچاوەی ئەحکامەکانی شەریعەتن.

هاوەڵە بەڕێزەکان - خوایان لێ ڕازی بێت - ئەم ئەحکامانەیان گێڕاوەتەوە و، ئەرکی ڕاگەیاندنی لایەنی ئاشکرای ژیانی پێغەمبەریان ﷺ بە تەواوی خستووەتە ئەستۆ.

بەڵام ڕیوایەتکردن و هەڵگرتن و ڕاگەیاندنی ئایین و ئەو ئەحکامانەی شەریعەت کە سەرچاوەیان حاڵەت و بارە نادیارەکانی ئەو پێغەمبەرەیە ﷺ و لە چوارچێوەی کاروبارە تایبەتی و کەسییەکانی ئەودان، تەنها خێزانە پاك و بێگەردەکانی ئەنجامیان داوە و ڕایان گەیاندووە. چونکە ئەم ئەرکەی ئەستۆیان بە ڕاستی و دروستی ئەنجام داوە و مافی خۆیان داوەتێ. تەنانەت نیوەی ئەحکام و نهێنییەکانی ئایین لە ڕێی ئەوانەوە وەردەگیرێن..

بەڵێ، ئەو فەرمانبەرییە مەزنە، پێویستی بە چەند خێزانێکی زۆر دەبێت کە مەشرەبیان لە یەکتر جیاواز بێت.

سەبارەت بە مارەبڕینی زەینەبیش لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ ئەوا لە تیشکی سێهەمی ڕۆشنایی یەکەمی "وتەی بیست و پێنجەم"دا[1] ، لە بارەی ئەم ئایەتەوە کە دەفەرموێ:

(١) مەبەست پەیامی "موعجیزاتی قورئانی"یە. (وەرگێڕ)

﴿ماكان محمَّدٌ أبا أحـــدٍ مـــن رجـالِكم ولكِـنْ رسـولَ اللهِ وخـاتَمَ النبيين﴾(الأحزاب: ٤٠)..

وتراوه كه:

تەنها یەك ئایەت چەندین واتای زۆر بە چەند ڕوویـەك و بـەپێی تێگەیشتنی چینەکانی خەڵکی، دەگەیەنێت..

ئەوەتا چینێکی خەڵك بەشیان لە تێگەیشتنی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا ئەمەیە:

حەزرەتی زەیـد - خـوای لـێ ڕازی بێـت - کـە بـەندەی ئـازادکراوی پێغەمبەرە ﷺ و ، شەرەفمەندی ئەوە بووە کە پێغەمبـەر ﷺ بە: "کـوڕم" بـانگی کردووە.. ئەم زەیدە، هەستی کرد هاوشـانی ئـەو هاوسـەرەی ژیـانی نی‌یـە کـە بەلایەوە ئازیزە. ناچار تەڵاقی دا. وەك چەندین ڕیوایەتی صـەحیح لـەم ڕووەوە هەیە و، زەید خۆیشی دانی بەمەدا ناوە.

واتـە زەینـەب لـە ئاستێکی بـەرزتری خـوو و ڕەوشـتدا بـەدی هێـنرابوو، زەیدیـش بە فیراسـەتی خـۆی هەسـتی بەمـە کـرد و، زانیـی شـایانی ئەوەیـە هاوسەری پێغەمبەرێك بێت نەك ئەو. چونکە هەستی کرد هاوشانی نی‌یـە. ئەمـەش بـوو بـەهۆی پێکـەوە نـەگونجانی دەروون و ڕۆحـی هـەردوو کیان. ئەوەبوو زەید تەڵاقی دا و، پێغەمبەریش ﷺ بە فەرمانێکی خوای گەورە مارەی کرد.

ئاماژەی ئایەتی پیرۆزی: ﴿زوّجناكـــها﴾ بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە بـە عەقدێکی ئاسمانی لە پێغەمبەر ﷺ مارە بڕراوە. کەواتە عەقدێکی نائاساییە و لـە سەرووی داب و عورف و مامەڵەی ڕواڵەتی‌یەوەیە، چونکە عەقدێکە تەنها بـە فەرمانی قەدەری خوای گەورە ئەنجام دراوە، بە ڕادەیەك کـە پێغەمبـەری ئـازیز ﷺ بە ناچاری ملی بۆ ئەو فەرمانەی خوای گەورە کەچ کرد، لە کاتێکدا کـە لە دەروونەوە حەزی لەو کارە نەبوو.

جا ئەم حوکمەی قەدەری خوای گەورە، فەرمانێکی شەرعیی گرنگ و، دانایی و بەرژەوەندی‌یەکی گشتیی تێدایە.

چونکە بەپێی ئاماژەی ئایەتی پیرۆزی:

﴿لكي لا يكون على المؤمنين حَرَجٌ في أزواجِ أدعيائِهم﴾ (الأحزاب:٣٧)..

ئەگەر مرۆڤ کەسی لە خۆی بچووکتر بە: "کوڕم" بانگ بکات، ئەوا ئەم بانگکردنە ئەحکامەکانی شەرع ناگۆڕێت. چونکە ئەمە هاوچەشنی ئەوە نی‌یە کە یەکێك بە ژنی خۆی بڵێت: "پشتی تۆ وەك هی دایکم وایە" کە بەوە ژنەکەی لێ حەرام دەبێت.

هەروەها پێغەمبەران - دروودیان لەسەر بێت - و گەورە پیاوان کاتێ لەگەڵ نەتەوەکان و میللەتانی خۆیاندا دەدوێن و بە چاوی باوکایەتی بۆیان دەڕوانن، تەنها لە ڕووی ئەرکی پێغەمبەرێتیی سەرشانیانەوەیە و، هەرگیز لە ڕوانگەی کەسێتیی مرۆڤانە و خزمایەتی‌یەوە نی‌یە، تاکو ژن هێنانیان لەوانە لێ حەرام بێت.

چینێکی تری خەڵك بەم جۆرە لە ئایەتەکە تێدەگەن کە:

سەرگەورەیەکی مەزن و فەرمانڕەوا، بە چاوی باوکایەتی‌یەوە بۆ میللەتەکەی خۆی دەڕوانێت، واتە: بە وێنەی باوك خاوەنی میهر و شەفقەتە بۆیان. جا ئەگەر ئەو فەرمانڕەوایە دەستەڵاتدارێکی ڕۆحیی ئاشکرا و پەنهان بێت، ئەوا میهرەبانی‌یەکەی چەندین ئەوەندەی هی باوکان زیاتر دەبێت و، خەڵکەکەش وەك بۆ باوکیان بڕوانن ئاوا بۆ ئەو دەڕوانن، وەك بڵێی منداڵی ڕاستەقینەی ئەو بن..

جا لەبەر ئەوەی کە گەلێ زەحمەتە ڕوانینی باوکایەتی بگۆڕێت بۆ مێردایەتی و، ڕوانینی کچایەتیش بە ئاسانی ناگۆڕێت بۆ ڕوانینی ژنێتی، ئەوا

عامەی خەڵكی بەلایانەوە زەحمەت بووە كە پێغەمبەر ﷺ یەكێك لە كچی ئیمانداران مارە بكات..

قورئانی پیرۆز ئەم تێگەیشتنە هەڵەیەی ئەوان ڕاست دەكاتەوە و، پێیان دەفەرموێ:

پێغەمبەر ﷺ گەلێ بەشەفەقەتە بۆ ئێوە و وەك باوك مامەڵەتان لەگەڵدا دەكات و، بە ڕوانینی میهرەبانیی خوای گەورە بۆتان دەڕوانێت. واتە سەبارەت بەو پەیامەی بۆی هێناون، ئێوە وەك كوڕی ئەو وان، بەڵام سەبارەت بە كەسێتیی مرۆڤانەی خۆی و لەو ڕووەوە، دیارە باوكی ئێوە نییە، تاكو ئەم ژن هێنانەی ئەوتان پێ زەحمەت بێت، هەرچەندە بە: (كچانم!.. كوڕانم!)یش لەگەڵتان بدوێت. چونكە ئێوە، بەپێی ئەحكامی شەرع، كوڕی ئەو نین. كەواتە نابن بە كوڕی ڕاستەقینەی.

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

# ڕەتدانەوەی گومانێك

پرسیار:

هـەندێ کەسـانی بیـانی چـەند گومـانێك لـەبارەی هـەندێ مەسـەلەی شەریعەتەوە دەهێنن، وەك "فرە ژنی" و "کۆیلایەتی". وەك بڵێن ئەمانـە لەگـەڵ شارسـتانێتیدا نـاگونجێن. ئیـتر لـەم ڕێیـەوە دوودڵـی و گومـان لـەبارەی شەریعەتەوە بڵاو دەکەنەوە.

وەڵام:

وا بە پوختی دەستوورێکتان بۆ باس دەکەم، چونکە نیازم وایە بە درێژی لە پەیامێکی سەربەخۆدا بڵاوی بکەمەوە:

ئەحکامی ئیسلام دوو بەشن:

یەکەم:

ئەوەیە کە شەریعەتی لەسەر بنیات دەنرێت، کـە خێر و جوانیـی بێگـەرد و ڕاستەقینەیە.

دووهەم:

شەریعەتی ڕاستێنەر(تەعدیل کار)ە. واتە: کاتێ شەریعەت دێ ئەو شتە لـە شـێوە ناشـیرینە سـتەمکارانەکەیەوە دەگۆڕێـت بـە شـێوەیەکی ئـەوتۆ لەگـەڵ کات و دەوروبەردا گونجاو بێت و بەپێی سروشتی مرۆڤ شایانی جێبەجێ کردن بێت..

ئەم کارەی شەرع بۆ وەرگرتنی شێوە "تـەعدیل کراوەکـە" مەبەسـت هەڵبژاردنی ئەو یەکەیانە کە زیان و شەڕی کەمتری تێدایە، تاکو کاتێ دێتە پێشەوە کە هێنانـەدیی جوانیی ڕاستەقینە بـە تـەواوی لـە توانا دەبێ. چونکە لابردنی کتوپڕیی شتێ کە لە سروشتی مرۆڤدا ڕەگـی داکوتـابێت، داخـوازی سەرەوخوون کردنی سروشتی مرۆڤە!

جا لەسەر بناغەی ئەم دەستوورە:

شەریعەت "کۆیلایەتی"ی دروست نەکردووە! بەڵکو تەنها شەریعەت بوو کـە ڕێـی بۆ ئـەوە ئاسـان کـرد کۆیلایـەتی لــە توندتریـن و سـەخت تریـن و ناخۆشـترین شێوەیەوە بگۆڕێـت، هـەتا وردە وردە بـە ئاسـانی دەتوانـرێ بـۆ "سەربەستی" و ئازادیی تەواو بگوێزرێنەوە. (هـەروەك لـە مێـژوودا بـەو جـۆرە کۆتایی بە کۆیلایەتی هێنا).

واتـە شـەریعەت هـات ئـەو شـێوە نـاڕەوا و ناشـیرینەی تـەعدیل کـرد و دیاردەکەشی کەم کردەوە.

پاشان "فرەژنی" تـا ڕادەی چـوار، هەرچـەند کارێکـە لەگـەڵ سروشـت و عـەقڵ و دانـاییدا گونجـاوە، لەگـەڵ ئەوەشـدا شـەریعەت نـەهاتووە لـە یەکـەوە بیگەیەنێتە چوار، بەڵکو لە هەشـت و نـۆوە کـەمی کردووەتـەوە بۆ چـوار! بـە تایبەت کە چەندین مەرجی ئەوتۆی داناوە کە ئەگـەر ڕەچاو بکرێـن زیـانێکی ئەوتۆی تێدا نابێت. خۆ ئەگەر لە هەندێ حاڵێدا "شـەڕ"ێـك ڕوو بـدات ئـەوا شـەڕێکی "سـووکتر" و "کـەمتر"ە. خـۆ "شـەڕی کـەمتر" دادگەرییـەکی نیسبییە، چونکـە زۆر دوور و مەحاڵـە خـێری پـەتی و بێگـەرد لـە هـەموو حاڵەتێکی ئەم جیهانەدا دەست بکەوێت!!

بەڵام ئەگەر خۆشویستنی ئەوانەت بە چەشنی ئەو خۆشویستنە بێت کە مەدەنی‌یەکان بۆ مرۆڤە بەناوبانگەکان هەیانە، ئەوا تەنها بیرکردنەوەت لە مەسەلەی نەمانی ئەو مەردە باش و ئەولیا کاملانە و، داڕزانی ئێسك و پێستیان لە گۆڕستانی هەرە مەزنی ڕابوردوودا، سەبارەت بە تۆ دەبێت بە ئازارێکی زیاد لە ئازارەکانی تری ژیانت و، هەر ئەم بیرکردنەوەیە وا لە مرۆڤ دەکات مردن و نەمانی خۆیشی بە هەمان جۆر ببینێت و، بەوپەڕی دڵەتەپێ و تاڵی و حەسرەتەوە بڵێت: (دەبێ منیش بڕۆمە ئەو گۆڕستانەی کە ئێسك و پێستی ئەو مرۆڤە مەزنانەی بەو جۆرە داڕزاند)..

بەڵام لە ڕوانگەی یەکەمەوە ئەو مەزنانە وا دەبینیت کە دوای ئەوەی پۆشاکی لەشیان لە ڕابوردوودا لەبەر داماڵی، ئێستا لە جیهانی بەرزەخدا - کە هۆڵی پێشوازی کردنە - لە خۆشی و بەختەوەری و حەوانەوەدان. ئیتر بە ڕوانینێکی پڕ لە تاسە و بێ پەژارە و ئازار، تەماشای گۆڕستان دەکەیت.

خۆشەویستیشت بۆ شتە جوان و کاروبارە پاکەکان، مادەم لە پێناوی خوای گەورە و ناسینی بەدیهێنەری مەزنیاندایە و بە ڕادەیەکە هانت دەدات کە بڵێیت: (چەندە جوان بەدی هێنراوە)! ئەم خۆشەویستی‌یە - خۆی لە خۆیدا - بیرکردنەوەیەکی بەلەزەتە، جگە لەوەی کە ڕێ لە بەردەم خۆشەویستی و تاسەمەندیی جوانیدا والا دەکات، تاکو بۆ چەندین پلەی تام و چێژی بڵند و بەرز بڕوانێت و، لەوێ گەنج و سامانە بەنرخەکانی ئەو گەنجینانەت پیشان دەدات، ئیتر مرۆڤ لەوێ بە کەیف و شادی‌یەکی بەرز سەرنجی ئەو گەنجینانە دەدات..

چونکە ئەم خۆشەویستی‌یە، چەندین ئاسۆ لە بەردەم "دڵ"دا دەکاتەوە، بۆ ئەوەی ڕوانینی دڵ لە سەیرکردنی شوێنەوارەکانی بەدیهێنەری مەزنەوە بگوێزێتەوە بۆ بینینی جوانیی کاروبارە ناوازەکانی ئەو بەدیهێنەرە و، لە جوانیی کاروبارەکانیەوە بۆ جوانیی ناوەکانی و، لە جوانیی ناوەکانیەوە بۆ

جوانیی سیفەتە مەزنەکانی و، لە جوانیی سیفەتە مەزنەکانیەوە بۆ جوانیی زاتی پاك و پیرۆزی بەدیهێنەری ئاراستە بکات.

ئەم خۆشەویستی‌یە بەم ڕێگایە، پەرستنێکی بەلەزەتە و لە هەمان کاتیشدا بیرکردنەوەیەکی بەرزی گەلێ بەتامە.

خۆشەویستیشت بۆ "لاوی" مادەم لەبەر ئەوەیە کە نیعمەتێکی جوانی خوای گەورەیە، ئەوا دیارە لە پەرستنی خوادا بەسەری دەبەیت و، بە نوقم بوون لە گوناهـ و نەفامیدا ئەو سەردەمەی ژیانت ناکوژیت. چونکە ئەو پەرستنانەی لە تافی لاویدا بەدەستیان دەهێنیت، چەند بەروبوومێکی پێگەیشتووی هەمیشەیین کە ئەو سەردەمە فانی‌یە بەرهەمی هێناون.

جا هەتا لەو قۆناغەی ژیانت دوور بکەویتەوە و بەساڵدا بچیت، پتر بەرهەمی نەبڕاوەی ئەو سەردەمەت دەست دەکەوێت و، وردە وردە لە بەڵاکانی دەروونی بەدخواز و گوناهباری‌یەکانی هەڵەشەیی لاوی ڕزگارت دەبێت و، لە دەرگانەی خوای گەورەی بە توانادا ئومێدەواری ئەوە دەبیت کە لە پیریدا بۆ دەستکەوتنی پەرستنی زیاتر پشتگیری و سەرکەوتووت بکات. ئیتر هەرگیز بێزت نایەت وەك ئەو بێ ئاگایانە وابیت کە پەنجا ساڵ لە تەمەنی پیریی خۆیان بە خەم و پەشیمانیی نەمانی لەزەت و خۆشیی پێنج و دە ساڵی لاوی‌یان بەسەر دەبەن، ئەو پەشیمانی و خەم و خەفەتەی کە شاعیرێك بەم دێڕە شیعرە دەری بڕیوە کە دەڵێت:

ألا ليتَ الشبابَ يعودُ يوماً فأُخْبِرَهُ بِمَا فَعَلَ الْمَشيبُ[1]

خۆشەویستیشت بۆ دیمەنە جوانەکان، بە تایبەت دیمەنەکانی بەهار، لەبەر ئەوەی لە دیدگای سەیرکردنی سنعەتە جوان و ناوەزەکانی خوای

(١) کورد لە واتای ئەم بەیتە شیعرە عەرەبی‌یەدا وتوویەتی:

خۆزگا گەنجی‌یەکەم ئەگەڕا دواوە گلەیی پیریم ئەکرد بەلاوە

گەورەوەیە، ئەوا تەواوبوون و بەسەرچوونی ئەو بەهارە هەرگیز لەزەتی بینین و سەیرکردنی نافەوتێنێت، بەڵکو واتا ڕەنگین و قەشەنگەکانی پشت پەردەی ئەو بەهارەت بۆ بەجێ دەهێڵێت، چونکە وەرزی بەهار، وەك نامەیەکی ڕەنگینی پەروەردگار وایە کە لە ڕووی بوونەوەراندا دەکرێتەوە.

جا هەریەك لە "کات" و "ئەندێشە"ت وەکو فلیمی سینەما وان، ئەو لەزەتی سەیرکردنەت بە هەمیشەیی و بەردەوامی بۆ دەهێڵنەوە و، هەردەم واتاکانی ئەو نامەیەی بەهارت بۆ نوێ دەکەنەوە.

کەواتە خۆشەویستی‌یەکەت "کاتی" و "نغرۆ"ی دەریای خەم و پەژارە نابێت، بەڵکو خۆشەویستی‌یەکی ساف و بێگەرد و بەتام و لەزەت دەبێت.

خۆشویستنی دنیاشت، لەبەر ئەوەی بۆ خوای گەورە و لە پێناوی ئەودایە، ئەوا بوونەوەرە سامناکەکانی ناوی بۆتۆ دەبن بە هاوڕێ و هاودەم.

ئنجا لەبەر ئەوەش دنیات لەو ڕووەوە خۆش دەوێت کە مەزرای دواڕۆژە، ئەوا دەتوانیت لە هەموو شتێکی ناویدا بەرهەمی وای لێ بچنیت کە بشێت بە یەکێك لە بەروبوومەکانی ئاخیرەت دابنرێت، یان شتێکی ئەوتۆی لێ قازانج بکەیت کە ببێت بە سەرمایەیەك بۆ دواڕۆژت. کەواتە گیروگرفتەکانی دنیا تۆ ناترسێنن و، نەمان و لەناوچوونیش بێزارت ناکەن.

بەم جۆرە ماوەی مانەوەت لە دنیادا وەك میوانێکی بەڕێز بەسەر دەبەیت.

بەڵام ئەگەر خۆشەویستیت بۆ دنیا وەك هی بێ ئاگایان وا بێت، مانای وایە - وەك چەندین جار پێمان وتوویت - لەناو خۆشەویستی‌یەکی بکوژی خنکێنەری لەناوچووی بێ سووددا خۆت نوقم دەکەیت، تا لە ئەنجامدا لەناودەچیت!

بەم چەشنە.. تێکۆشاین کە یەك لە سەدانی ئەو سوودە ناسکانە باس بکەین کە دەگەڕێنەوە بۆ خۆشویستنی ئەوانەی باست کردن، کاتێ بە ڕێنمایی

قورئانی پیرۆز خۆشت بوێن. لە هەمان کاتیشدا ئاماژەمان بۆ یەك لە سەدانی ئەو زیانانە کرد کە ئەگەر ئەو خۆشەویستی‌یە بەپێی فەرمانی قورئانی پیرۆز نەبێت.

**پاشان..** ئەگەر دەتەوێت ئەنجامەکانی ئەم خۆشەویستی‌یە جۆراوجۆرانە لەودنیا و جیهانی دواڕۆژدا بزانیت، وەك ئەوەی کە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز ئاماژەیان پێ داوە، ئەوا بە کورتی لە نێوان سوودەکانی ئەو خۆشەویستی‌یە جۆراوجۆرە ڕەوایانەدا یەك سوودت بۆ ڕوون دەکەینەوە، ئەمەش لە "نۆ" ئاماژەدا، دوای ئەوەی کە پێشەکی‌یەکی لە پێشدا بۆ باس دەکەین.

**پێشەکی**

خوای گەورە، بە: خوایەتیی مەزن و، میهرەبانیی جوان و، پەروەردگاریی گەورە و، بەزەیی بەخشندانە و، توانای مەزن و، دانایی نەرمونیانی خۆی، ئەم مرۆڤە بچووکەی بە چەندین هەست و شعووری تابلێی زۆر ئارایشت داوە و، بە ئەندام و ئامێری گەلێ جۆراوجۆری زۆریش ڕازاندوویەتەوە، تاکو هەستی بە چینەکانی بەزەییە فراوانەکەی پێ بکات و، جۆرەکانی نیعمەتە لەژمارەبەدەرەکانی خۆی پێ بچێژێت و، بەشە لەبن نەهاتووەکانی چاکەکاری‌یەکانی خۆی پێ بناسێنێت و، لە ڕێی ئەو ئامێر و ئەندامە زۆرانەوە جۆرە بێ سنوورەکانی درەوشانەوەی هەزار و یەك ناوی خۆی پێ پیشان بدات، ئنجا مرۆڤیش بە باشی ڕێزی شایانیان لێ بگرێت.

هەریەك لەو ئەندام و ئامێرە زۆرانەی مرۆڤ، چەندین کار و فرمانی جۆراوجۆر و پەرستنی جیاجیایان هەیە و، لەزەت و ئازار و پاداشتی هەریەکەشیان لەوانی تر جیاوازە.

بۆ نموونـە: "چـاو" جوانیـی وێنـەکان و موعجیزاتی توانستی قەشـەنگ و جوانی خوای گەورە لـە جیهانی بینراو(عالم الشهادة)دا دەبینێت، ئیـتر لـێرەدا بەو شـوکرانەبژێرییە کـە لـە ڕێـی سـەیرکردنی پڕ لـە دەرس و پەندەوە دەری دەبڕێت، کار و فرمانی خۆی بەجێ دەهێنێت.

خۆ لەزەتی بینین و ئازاری نەمانی ئـەو لەزەتـە لـە هیـچ کەسێك شـارراوە نییە، کەواتە پێویست بە پێناساندنی ئەو لـەزەت و ئازارە ناکات.

نموونەیەکی تر: "گوێ" هەست بە نەرمونیانیی میـهرەبانیی خـوای گـەورە دەکات کە لـە جیـهانی شتە "بیسـتراوەکان"دا هـەن، لـە ڕێـی بیستنی هـەموو جۆرە دەنگ و ئاوازە ناسك و خۆشە جیاجیاکانەوە.

کەواتە "گوێ" پەرستن و، ئازار و، پاداشتی تایبەتیی خۆی هەیە.

نموونەیەکی تر: هەستی "بۆنکـردن" کـە هەسـت بـە نـەرمونیانی و جوانیـی میهرەبانیی خوای گەورە دەکات کە لە بۆنی جۆرەهای جـۆری عـەتر و بـۆی خۆشەوە پەیدا دەبێت.

کەواتە ئـەویش لـە چوارچێوەی شـوکرانەبژێریی تایبـەتیی خۆیـدا لـەزەتی تایبەتیی هەیە و، بێ هیچ گومانێك پاداشتی تایبەتیشی هەیە.

نموونەیەکی تر: هەسـتی "چەشـتن" کـە لـە دەمدایـە، کـار و فرمـانی خـۆی بەجێ دەهێنێت و شـوکرانەبژێریی مەعنـەویی خـۆی بـە چـەندەها جـۆر ئـەنجام دەدات، لە ڕێی هەست کردنیەوە بە تـام و چێژ و لـەزەتی هـەموو جۆرەکـانی خواردەمەنی.

بەم چەشنە.. هەریـەك لـە ئـامێر و هەسـت و ئەندامـەکان و، یـەك بـە یـەکی لایەنـە ناسـکە گرنگـەکانی مـرۆڤ وەك: دڵ و گیـان و جگــە لەمانــەش، فەرمانبەریی جیاجیـا و لـەزەتی جۆراوجـۆری تایبـەتیی خۆیـان هەیـە، خـۆ بـێ

هیچ گومانێك ئەو خواوەندەی كە ئەم هەموو ئامێرانەی لەو فەرمانبەری‌یانەدا خستووەتەكار، پاداشتی گونجاوی هەموو یەكێكیان دەداتەوە.

ئەنجامە دنیایی و زۆرەكانی ئەو جۆرە جیاجیایانەی خۆشەویستی - كە باس كران - هەموو مرۆڤێك لە خۆیدا هەستیان پێ دەكات و، بە چەشنێكی بێ گومان و ڕاست، دڵنیایە لەم هەستكردنەی خۆی.

ئەنجامەكانی سەر بە دوارۆژیشیان، "دوازدە" ڕاستیی درەخشانی پەیامی "حەشر" و، "شەش" بنچینەی ڕوونی پەیامی "مەلائیكەت" چەسپاندوویانە.

ڕوونكردنەوەی دووروودرێژی ئەم ئەنجامانەش، بە جۆرێكی گومانبڕ و بە دەقی قورئانی پیرۆز چەسپاوە، كە ڕاستترین گوفتار و ڕەوانترین ڕێسایە و گوفتاری خواوەندی پادشای بەدەستەڵاتی بە هەموو شت ئاگایە. چونكە ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز، چ بە ڕاستەوخۆ و ڕاشكاوی چ بە ئاماژە و هێما، ئەمەیان چەسپاندووە. لەبەر ئەوە، بە پێویستی نازانین بەڵگەی دوور و درێژ لەم ڕووەوە بهێنینەوە. دەبێ ئەوەش بزانین كە لە چەند "وتە"یەكی تر و لە مەقامی دووهەمی عەرەبیی پەیامی "بەهەشت"دا، كە "وتەی بیست و هەشتەم"ە و، لە پەیامی "مەلائیكەت"دا، كە "وتەی بیست و نۆهەم"ە، بەڵگەی گەلێ زۆر و زەبەندەمان لەسەر هێناوەتەوە.

❖ ئاماژەی یەكەم:

ئەنجامی "دوارۆژ" بۆ خۆشویستنی ڕەوا و هاودەمی شوكرانەبژێری، بۆ خواردەمەنی و میوە خۆش و بەلەزەتەكانی دنیا، ئەو خواردەمەنی و میوە بەلەزەتانەیە كە شایانی بەهەشتی هەمیشەیین، وەك دەقی قورئانی پیرۆز ڕایدەگەیەنێت..

ئەم خۆشەویستی‌یە - لە ڕاستیدا - خۆشەویستی‌یەكی پڕ حەز و تاسەیە بۆ بەهەشت و میوەكانی، بە ڕادەیەك ئەو میوەیەی لەم دنیایەدا دەیخۆیت و

"الحمد لله"ی لەسەر دەکەیت، لە بەهەشتدا دەبێت بە میوەیەکی بەرجەستەی خاوێن و پێشکەشت دەکرێت. کەواتە تۆ لێرە "میوە" دەخۆیت و لەوێیش "الحمد لله" تۆش دەکەیت لە شێوەی میوەیەکی بەرجەستەی بەهەشتدا!

جا لەبەر ئەوەی خواردەمەنی و میوەکان کە لێرە دەیانخۆیت، نیعمەت بەخشین و ئاوڕدانەوەی پەروەردگاریان تێدا دەبینیت و، بەم کارەشت شوکرانەبژێریی مەعنەوی‌یان لەسەر پێشکەش دەکەیت، ئەوا لە بەهەشتدا بۆت دەبن بە خواردەمەنی و میوەی خۆش و پێشکەشت دەکرێن، وەك بە دەقی فەرموودەی پیرۆز و ئاماژەکانی قورئان چەسپاوە و، دانایی و میهرەبانیی فراوانی خوای گەورەش داخوازیەتی.

❖ **ئاماژەی دووهەم:**

خۆشویستنی ڕەوای "نەفس"(دەروون) واتە: خۆشویستنی لە دنیادا لەسەر بناغەی: بینینی کەموکووڕی‌یەکانی نەك چاکی‌یەکانی و، هەوڵدانی پێگەیاندن و چاودێری و پاکژکردنی بە شەفەقەت و میهرەبانی و، هاندانی بۆ ڕێی خێر و چاکە.. ئەنجامی ئەو خۆشەویستی‌یە کە بەم چەشنە بێت، ئەوەیە کە بەدیهێنەری مەزن لەودنیادا چەندین خۆش ویستراوی ئەوتۆی پێ دەبەخشێت کە شایانی ئەو نەفسە و بەهەشت بێت..

چونکە ئەو "نەفس"ەی لە دنیادا لە پێناوی خوای گەورە وازی لە هەوا و ئارەزووی خۆی هێناوە و، ئەندام و ئامێرە جۆراوجۆرەکانیشی بە باشترین و تەواوترین شێوە بەکار هێناوە، خواوەندی بەدیهێنەری بەخشندە لە پاداشتی ئەو خۆشەویستی‌یە ڕەوا و ئاوێتەی خواپەرستی‌یەدا، بە "حور العین" پاداشتی دەداتەوە کە لە حەفتا چەشنی پۆشاکی بەهەشتدا خۆیان دەنوێنن. ئەو بەهەشتەی کە دارای چەندین جۆری جوانی و ناسکی و نەرمونیانی‌یە و، ئەو حۆری‌یانەش کە خاوەنی حەفتا جۆری جوانین، بە ڕادەیەك کە دەڵێی هەر بۆ

خۆیان بەهەشتێكی بەرجەستەی بچووكن و گیانیان بە بەردا كراوە، تاكو چاوی ئەو "نەفس"ەی پێ بگەشێتەوە كە گوێڕایەڵیی خوای گەورەی كردووە و، ئەو هەستانەشی پێ بسرەوێت كە ملكەچی فەرمانەكانی خوای گەورە بوون.. ئەم ئەنجامە هیچ گومانێكی تێدا نییە، چونكە ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز بە دڵنیایی ڕایدەگەیەنن.

پاشان ئەنجامی خۆشەویستیی "لاوی"، واتە ئەنجامی بەكارهێنانی هێز و هەرەتی تافی لاوی لە پەرستن و تەقوادا: لاویەكی هەمیشەییە لە خانەی مانەوە و نیعمەتی بەردەوامی بەهەشتدا.

❖ ئاماژەی سێهەم:

ئەنجامی دواڕۆژیش بۆ "خۆشەویستیی هاوسەری ژیان" كە لەسەر بناغەی ڕەوشت جوانی و شەفقەتە نەرمونیانەكەی خۆشت بوێت، ئەو خۆشەویستییەی كە لە سەرپێچی و گوناهباری بیپارێزێت، ئەنجامی ئەم خۆشەویستییە ئەوەیە كە ئەو هاوسەرە باشە لە بەهەشتدا دەبێت بە خۆشەویست و هاوڕێی ڕاست و هاودەمی دڵدەرەوەی مرۆڤ.. هەروەها جوانی و قەشەنگی و ڕازاوەیی ئەو لە بەهەشتدا گەلێ لە هی "حور العین" دڵگیرتر و قەشەنگتر دەبێت و، لەگەڵ مێردەكەیدا بە خۆشی و كامەرانی دەدوێن و ڕووداوەكانی ڕۆژگارانی پێشوویان یاد دەكەنەوە.. خواوەندی میهرەبانی بەخشندە ئاوا بەڵێنی داوە، خۆ مادەم بەڵێنی داوە، دەیباتەسەر.

❖ ئاماژەی چوارەم:

ئەنجامی خۆشەویستیی "دایك و باوك و منداڵ"یش ئەوەیە كە: هەرچەند ئەو خێزانە بەختەوەرە پلەكانی بەهەشتیان لە یەكتر جیاوازە، بەڵام خوای گەورەی بەخشندەی میهرەبان چاكەیان لەگەڵ دەكات و بە یەكتریان شاد دەكاتەوە، ئەوانیش لەگەڵ یەكتر دادەنیشن و گفتوگۆ دەكەن بە چەشنێك

کە شیاوی بەهەشت و خانە و لانەی هەمیشەیی بێت، وەك بە دەقی قورئان ئەمە چەسپاوە.

هەروەها ئەو منالآنەش کە پێش بالغ بوونیان لە دنیا کۆچیان کردووە، خواوەند نیعمەتی یاری و گەمە و گالتەکردن لەگەڵیاندا بە باوك و دایکانیان دەبەخشێت و، ئەو منالآنەیان بۆ دەکات بە منالی هەمیشەیی(ولدان مخلدون) لە جوانترین و خۆشەویستترین شێوەدا کە حەزی پێ بکەن..

بەمەش ئارەزووی گەمە و گالتەکردن لەگەڵ منالدا، کە لە ناخی سروشتی مرۆڤدا ڕەگی داکوتاوە، دابین دەبێت. ئیتر تام و لەزەتێکی هەمیشەیی و بەردەوامی لە بەهەشتدا لێ دەچێژن، چونکە ئەو منالە بچووکانەی کە نەگەیشتوونەتە تەمەنێك هیچ تەکلیفێکیان لێ بکرێت، بە نەمری و هەمیشەیی لەگەڵیاندا دەمێننەوە.

زووتر وا گومان دەبرا کە لەبەر ئەوەی لە بەهەشتدا زاوزێ نییە، ئەوا یاری و گالتە و گەپیشی لەگەڵ منالدا تێدا نییە! بەلآم لەبەر ئەوەی کە بەهەشت باشترین لەزەتەکانی دنیای تێدایە، ئەوا دەبێ یاری و گالتە و گەپیشی لەگەڵ منالدا – بە باشترین و جوانترین شکڵ و شێوە – تێدا بێت.

کەواتە مژدەبێت لەو باوك و دایکانەی کە لە دنیادا جگەرگۆشە و کۆرپەکانیان کۆچیان کردووە!

❖ ئاماژەی پێنجەم:

ئەنجامی خۆشەویستیشت بۆ هاوڕێ و خزمە باشەکانت کە بە داخوازیی: "الحب في الله" خۆشت دەوێن، لەوەدایە کە لەودنیادا بەرامبەر یەکتری دادەنیشن و یادداشتەکانی زووتری ڕۆژانی دنیا و یادە جوانەکانتان بۆ یەکتر دەگێڕنەوە و، کاتێکی خۆش و شاد بەم چەشنە گفتوگۆ و دانیشتنە بەسەر دەبەن، وەك بە دەقی قورئانی پیرۆز چەسپاوە.

❖ ئاماژەی شەشەم:

ئەنجامی خۆشویستنی پێغەمبەران - درووردیان لەسەر بێت - و ئەولیا و پیاوچاکانیش، وەك قورئانی پیرۆز روونی دەکاتەوە، ئەوەیە کە: شەفاعەتی ئەو پێغەمبەرە بەرێز و ئەولیا و پیاوچاکانەت لە جیهانی بەرزەخ و حەشری مەزندا دەست دەکەوێت، سەرەڕای ئەوەی کە تۆ بەم خۆشەویستییەت لە ڕێژنەی پلە بەرز و شیاوەکانی ئەوانەوە سوودمەند و بەهرەوەر دەبیت.

بەڵێ، دەقی فەرموودەی پیرۆز ڕایدەگەیەنێت کە: "المرء مع من أحب"[1]. کەواتە مرۆڤ دەتوانێت بە پەیوەندیی خۆشەویستی و شوێنکەوتنی خۆشەویستەکەی، بگات بە بڵندترین پلەی ئەو خۆشەویست و هاوەڵەی خۆی.

❖ ئاماژەی حەوتەم:

خۆشویستنی شتە جوانەکان و بەهاریش، واتە بۆڕوانینیان لەو ڕوانگەیەوە کە دەڵێت: (چەندە جوان دروست کراوە) و، ئاراستە کردنی ئەو خۆشەویستییەت بۆ ئەو جوانییانەی وان لە پشتی ئەو شتە جوانەوە، هەرووەها بۆ جوانیی کردار و ڕێکوپێکییان و بۆ جوانیی درەوشانەوەکانی ناوە جوانەکانی خوای گەورە کە لە پشتی ئەو کردارانەوەن و، بۆ درەوشانەوەی سیفەتە مەزنەکان کە لە پشتی ئەو ناوە جوانانەوەن... هتد بەم پێیە تا دەڕوات.. ئەنجامی ئەم خۆشویستنە ڕەوایە:

بینینی جوانییەکی ئەوتۆیە کە هەزاران ئەوەندەی ئەو جوانییە بڵندەی کە لە بەدیهێنراواندا بینیت بەرز و باڵاترە. واتە بینینی درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خوای گەورە و جوانیی سیفەتە مەزنەکانیەتی، بە چەشنێك

---

(١) رواه البخاري، كتاب الأدب.

شیاوی بەهەشت بێت. ئەمەش لە ڕادەیەکی وادایە کە ئیمامی ڕەبانی - خوا لێی ڕازی بێت - فەرموویەتی: (جوانی و نەرمی و ناسکییەکانی بەهەشت، لە ڕاستیدا، وێنە و تیشکدانەوەی ناوە جوانەکانی خوای گەورەن). ئنجا تۆیش فەرموو بیری لێ بکەرەوە!

❖ **ئاماژەی هەشتەم:**

خۆشەویستیی ڕەوا و شیاوت بۆ دنیا، واتە ئەگەر دنیات لەگەڵ بیرکردنەوەدا لە دوو ڕووە جوانەکەی خۆش بوێت کە بریتین لەوەی "کێڵگەی دواڕۆژە" و "ئاوێنەی درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خوای گەورەیە"، ئەنجامی دواڕۆژی ئەم خۆشەویستییە ئەوەیە کە:

لەودنیادا بەهەشتێکی ئەوەندە فراوانت پێ دەبەخشرێت کە جێی هەموو ئەم دنیایەی تێدا دەبێتەوە، بەڵام وەکو ئەم دنیا نییە، واتە لەناو ناچێت، بەڵکو هەمیشەیی و بەردەوامە. ئنجا لە ئاوێنەکانی ئەو بەهەشتەدا درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خوای گەورەشت - کە لە دنیادا هەندێکت لە سێبەرە لاوازەکانی بینی - بە ڕەنگینترین درەخشانی و جوانی پیشان دەدرێن.

پاشان خۆشەویستیی دنیا لەو ڕووەوە کە "کێڵگەی ئەودنیایە" واتە بەو حسابەی کە دنیا شەتڵگایەکی گەلێ بچووکە بۆ چاندنی ئەو تۆوانەی لە دواڕۆژدا بەر دەگرن، ئەنجامی ئەم خۆشویستنەی کە لەم ڕووەوەیە:

میوە و بەروبوومی بەهەشتێکە کە جێی هەموو دنیای تێدا دەبێتەوە، چونکە سەرجەمی ئەو هەست و شعوورانەی کە لە دنیادا بۆ مرۆڤ وەکو تۆوی بچووك وابوون، لەو بەهەشتەدا هەموویان بە تەواوی دەپشکوێن و سەر دەردەهێنن و، تۆوە بچووکەکانی توانا و لێهاتن و ئامادەییە سروشتییەکانی ناخی مرۆڤیش لەوێ وەك گوڵەگەنم دەمیان بە گوڵ دەکەنەوە و هەموو جۆرەکانی لەزەت و کەماڵات لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرن..

ئەم ئەنجامە بەپێی داخوازیی میهرەبانیی فراوان و دانایی ڕەهای خوای گەورە، ئەنجامێکی ڕەوا و سەلمێنراوە. جگە لەوەش کە بە دەقی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ و ئاماژەکانی قورئانی پیرۆزیش چەسپاوە.

جا لەبەر ئەوەی تۆ دنیات لەبەر ئەو ڕووە چەپەڵ و خراپەی خۆش نەویستووە کە سەرچاوەی هەموو تاوانێکە، بەڵکو خۆشەویستی‌یەکەت ئاراستەی دوو ڕووەکەی تری کردووە، واتە ئەو خۆشەویستی‌یەت بۆ دنیا ڕووی لە "ناوە جوانەکانی خوا" و "دواڕۆژ"ە و لە پێناوی ئەم دوو ڕووەیدا پەیوەندیت لەگەڵدا بەستووە و، بە نیازی خواپەرستی ئەو دوو ڕووەی ئەوت ئاوەدان کردووەتەوە، کە ئەمەش لە ڕادەیەکدایە وەك ئەوەی پڕ بە هەموو دنیا خواپەرستیت کردبێت..

ئەوا بزانە ئەو پاداشتەی کە لەم خۆشەویستی‌یەوە دەستت دەکەوێت دەبێ لەم دنیایە گەلێ فراوانتر بێت. ئەمەش شتێکە میهرەبانی و دانایی خوای گەورە داخوازیەتی.

پاشان مادەم ئەم خۆشەویستی‌یەت لەبەر خۆشەویستیی قیامەت بووە و دنیات کردووە بە کێڵگەیەك بۆ دواڕۆژ و، خوای گەورەت لەگەڵدا خۆش ویستووە و، دنیات بە ئاوێنەیەك زانیوە بۆ پیشاندانی ناوە جوانەکانی.. ئەوا بێ هیچ گومانێك دەبێ لە بەرامبەر و لە پاداشتی ئەم خۆشەویستی‌یەدا، خۆش ویستراوێك دابنرێت کە لەم دنیایە فراوانتر بێت. دیارە ئەو پاداشتە جگە لەو بەهەشتەی کە لە ئاسمانەکان و زەوی فراوانترە، هیچی تر نی‌یە.

پرسیار: چ سوودێك هەیە لەو بەهەشتەدا کە بە ئەندازەی دنیا فراوان بێت؟

وەڵام: ئەگەر بتوانیت بە خێرایی ئەندێشە بە هەموو هەرێم و لایەکی گۆی زەویدا بڕۆیت و، پاشان سەر لە زۆربەی ئەستێرەکانی ئاسمان

بدەیت، ئەوا دەڵێیت: (هەموو جیهان هی منە). ئەم بڕیارەشت ڕێ لە بوونی مەلائیکەت و خەڵکانی تر و زیندەوەران ناگرێت کە لەم جیهانە فراوانەدا لەگەڵتدان.. بە هەمان جۆر دەتوانیت بڵێیت: (ئەو بەهەشتە هی منە) با پڕیش بێت لە کەسانی تر کە دەچنە ناویەوە.

لە پەیامی "بەهەشت"دا کە وتەی بیست و هەشتەمە، هەروەها لە پەیامی "ئیخلاس"دا ئەو فەرموودەیەمان ڕوون کردووەتەوە کە دەفەرموێ:

(بەهەشتی هەندێ کەس فراوانی‌یەکەی پێنج سەد ساڵە).

❖ ئاماژەی نۆهەم:

ئەنجامی ئیمان بە خوای گەورە و خۆشویستنی:

بینینی جوانیی خاوێن و کەماڵی بەرز و پاکی زاتی مەزنی خوای گەورەیە، وەك بە فەرموودەی "صەحیح" چەسپاوە[1]. سەعاتێکی ئەم بینینە، هەزار هەزار ساڵی نیعمەتەکانی تری بەهەشت دەهێنێت[2]، کە سەعاتێکی ئەو نیعمەتانەی بەهەشتیش هەزار هەزار ساڵی خۆش گوزەرانیی دنیا دەهێنێت. وەك بە یەکدەنگی لای زانایان و ئەهلی کەشف چەسپاوە.

---

(١) عن أبي هريرة رضي الله عنه أن ناساً قالوا: يا رسول الله هل نرى ربنا يوم القيامة؟ فقال رسول الله ﷺ: هل تضارون في رؤية القمر ليلة البدر؟ قالوا: لا يا رسول الله. قال: هل تضارون في الشمس ليس دونها سحاب؟ قالوا : لا. قال: فإنكم ترونه كذا. فەرموودەکە بە درێژی ئیمامی بوخاری و ئیمامی موسلیم ڕیوایەتیان کردووە.

(٢) لە دەقی فەرموودەدا هاتووە کە: "...قال: فيكشف الله تبارك وتعالى تلك الحجب، ويتجلى لهم، فيغشاهم من نوره شيء لولا أنه قضى عليهم أن لا يحترقوا لاحترقوا مما غشيهم من نوره. قال: ثم يقال لهم ارجعوا إلى منازلكم. قال فيرجعون إلى منازلهم وقد خفوا على أزواجهم وخفين عليهم مما غشيهم من نوره تبارك وتعالى. فاذا صاروا إلى منازلهم تراد النور وأمكن حتى يرجعوا إلى صورهم التي كانوا عليها. قال فتقول لهم أزواجهم: لقد خرجتم من عندنا على صورة، ورجعتم على غيرها؟ قال: فيقولون: ذلك بأن الله تبارك وتعالى تجلى لنا فنظرنا منه ما خفينا به عليكم..."(رواه البزار- بڕوانە: الترغيب والترهيب للمنذري ج٤/ص ٥٥٦- پەراوێزی دانەر خۆیەتی. واتای فەرموودەکەی هێناوە، ئێمە دەقەکەیمان هێنا).

بەم نموونەی خوارەوە دەتوانیت ڕادەی ئەو شەوق و تاسەمەندی و ئارەزووە توند و بەتینە لێك بدەیتەوە كە بۆ بینینی ئەو جوانی‌یە خاوێن و كەماڵە بەرز و پاكە لە سروشتی مرۆڤدا قوڵپ دەدات و لە جۆش و خرۆشدایە:

هەموو مرۆڤێك لە هەست و دەروونی خۆیدا حەزێكی بەتینی تێدایە بۆ بینینی حەزرەتی سلێمان - دروودی خوای لەسەر بێت - كە "كەماڵ"ی پێ بەخشرا بوو.. هەروەها هەستیش بە تاسەمەندی‌یەكی گەرموگوڕ دەكات بۆ بینینی حەزرەتی یوسف - دروودی خوای لەسەر بێت - كە بەشێكی "جوانی"ی پێ سپێردرابوو..

ئایا دەبێ حەز و ئارەزوومەندیی مرۆڤ چەندە بێت بۆ بینینی "جوانی"یەكی خاوێن و "كەماڵ"ێكی بەرز و پاك، كە بەهەشتی هەمیشەیی بە هەموو جوانی و نیعمەت و كەماڵاتێكیەوە، كە چەندەها جاری لەژمارەبەدەر لە "جوانی" و "كەماڵ"ی دنیا بەرزترە، یەكێكە لە درەوشانەوەكانی ئەو جوانی و كەماڵە؟

اللهم ارزقنا في الدنيا حبَّك وحبَّ ما يقربنا إليك، والإستقامةَ كما أمرت، وفي الآخرة رحمَتَك ورؤيتَك.

﴿سبحانَك لا علمَ لنا إلاّ ما عَلَّمْتَنا إنكَ أنتَ العليمُ الحكيم﴾.

اللهم صلِّ وسلِّمْ على من أرسلْتَه رحمةً للعالمين، وعلى آله وصحبه أجمعين. آمين.

مەکتووبی حەڤدەهەم:

# پرسەی منالێك

باسمه سبحانه

﴿وَإنْ مِنْ شَيءٍ إلاّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

بۆ برای ئازیزی ئاخیرەتم، بەڕێز: "حافظ خالید"!

بسم الله الرحمن الرحیم

﴿وَبَشِّـــرِ الصَّابِرِينَ ۞ الَّذينَ إذا أَصابَتْهُمْ مُصيبَةٌ قالُوا إنَّا للهِ وَإنَّا إلَيْهِ راجِعُونَ﴾ (البقرة:١٥٥-١٥٦)

برام!

هەواڵی مردنی منالەکەتان گەلێ ئازاری دام. بەڵام هەموو فەرمانێك بە دەستی خوای گەورەیە. ڕازی بوون بە قەزا و تەسلیم بوون بە قەدەری ئەو، درووشمی موسڵمانێتی‌یە.

لە خوا دەپاڕێمەوە ئارامی‌یەکی ڕەنگینتان پێ ببەخشێت و، منالەکەتان بۆ بکات بە پشتگیر و تکاکار لە ڕۆژی دواییدا.

وا لێرەدا بۆ ئێوە و بۆ هەموو موسڵمانێکی خاوەن تەقوا و لە خوا ترس، پێنج خاڵی وا باس دەکەین کە مزگێنی‌یەکی خۆش و دڵدانەوەیەکی ڕاستەقینەیان تێدا بێت:

● خاڵی یەكەم:

واتا و نهێنیی ئایەتی پیرۆزی: ﴿وِلْدانٌ مُخَلَّدُون﴾ بەم جۆرەیە:

منالی ئیماندارانی كە پێش بالغ بوونیان كۆچی دواییان كردووە، لە بەهەشتدا بە خۆشەویستی دەمێننەوە و هەتاهەتایی دەبن بە شێوەیەك كە شیاوی بەهەشت بێت و، دەبن بەهۆی دڵخۆشی بۆ دایكان و باوكانیان كە ڕۆشتوونەتە بەهەشت و، ناسكترین چیژی هەمیشەیی بۆ ئەو دایك و باوكانە دابین دەكەن كە بریتی‌یە لە خۆشەویستی و دواندنی منالْ.

جا لەبەر ئەوەی هەموو شتێكی خۆش و بەلەزەت لە بەهەشتدا هەیە، ئەوا ئەو وتەیە ڕاست نی‌یە كە دەڵێ: (لەبەر نەبوونی زاوزێ لە بەهەشتدا، خۆش ویستنی منالیشی تێدا نی‌یە و، گەمە و گاڵتەش لەگەڵیاندا لەوێ دەست ناكەوێت)..

نەخێر.. ئەم وتەیە ڕاست نی‌یە. چونكە خۆشەویستیی منالان - كە دەسكەوتێكی گەورەیە - و گەمە و گاڵتە كردن لەگەڵیاندا، بە ملیۆنەها ساڵ لە بەهەشتدا، بەوپەڕی ڕێكوپێكی و دوور لە هەموو تاریكی و لێڵی‌یەك بەردەوام دەبێت، لە بریی ئەو دە ساڵە كورت و پڕ ئەشكەنجە و ئازارەی كە لە دنیادا لەگەڵیان دەبرێتە سەر.

ئەم ئایەتە پیرۆزە بە ڕستەی: ﴿وِلْدانٌ مُخَلَّدُون﴾ هەموو ئەم واتایانەمان پێ ڕادەگەیەنێت و، ئەمەش دەبێتە مزگێنی‌یەكی گرنگ بۆ باوەڕداران و بەختیاری‌یەكە بۆ دوارۆژیان.

● خاڵی دووهەم:

سەردەمێك پیاوێك لە بەندیخانەدا بوو. ماوەیەكی زۆری نەخایاند كوڕە خۆشەویستەكەشیان خستە لای! ئیتر جگە لە ئازاری تایبەتیی خۆی، ئازاری

کوڕەکەشی و نەتوانینی داپین کردنی حەوانەوەی، ئـەوەندەی تـر ئازارەکـەی ئەوی زیاد کردبوو..

فەرمانڕەواکەش، لەبەر ئەوەی زۆر میهرەبان بوو، مرۆڤێکـی نـارد بـۆ لای ئەم پیاوە کە پێی بڵێت:

(هەرچەند ئەم منالە کوڕی تۆیە، بەڵام لـە هـەمان کـاتدا یەکێکـە لـە دانیشـتووانی وڵاتەکـەم و گەلەکـەم. وا ئێسـتا دەیبـەم بـۆ لای خـۆم و لــە کۆشکێکی گەورەی ڕەنگین و ڕازاوەدا پەروەردەی دەکەم).

باوکە بەندکراوەکەش کە ئەمەی بیست، دەستی دایە گریـان و ئـاخ و ئۆف کردن و خەفەت خواردن.. پاشان وتی:

(نـەخێر، ناتاندەمـێ.. چونکـە ئـەم کـوڕە هـۆی دڵنەواییمـە لـەم بەندیخانەیەدا)!

هاوەڵەکانی بەندیخانەی پێیان وت:

(برادەر! هیـچ پێویسـت بـە خـەم خـواردن ناکـات و خەفـەتیش دادی تـۆ نادات. ئەگەر تۆ خەمی کوڕەکەتـە، ئـەوا ئـەو بـۆ کۆشـکێکی بـەرینی ڕازاوە دەڕوات لە بریی مانەوەی لەم بەندیخانە تەنگ و نالەبار و ڕزیوەدا. خۆ ئەگـەر خەمی خۆشتە و بە دوای بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆتـدا دەگـەڕێیت، ئـەوا بـاش بزانە کـە ئەگـەر کوڕەکـەت لـێرەدا بۆ مەبەستی دڵدانـەوە و خـەمڕەوێنیی تـۆ بمێنێتەوە - کـە ئەمـەش سـوودێکی کاتییـە و لەوانەیشـە هـەرگیز نەیەتـەدی - تووشی ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆر دەبێت.

بەڵام ئەگەر بڕواتـە ئـەو کۆشـکەی پادشـا، دەبێـت بـە هـۆی دەسـتکەوتنی هەزاران سوود بۆتۆ، چونکە مانـەوەی ئـەو لـەوێ، دەبێتـە تکاکـارت و هـۆی جووڵاندنی بـەزەیی فـەرمانڕەوا سـەبارەت بـە تـۆ، ئیـتر ڕۆژێـك دێتـە پێـش کـە فەرمانڕەوا حەز بکات لەگەڵ کوڕەکەتدا بە یەکتر شاد ببنەوە. خۆ گومانیشی

تێدا نی‌یە کورەکەت نانێرێتەوە بەندیخانە بۆ لای تۆ، بەڵکو تۆ دەردەکات و دەتباتە ناو ئەو کۆشکە و، لەوێ بە دیتنی شاد و بەختەوەر دەبیت.. ئەمە لە کاتێکدا کە ئەگەر تۆ گوێڕایەڵی پادشا بیت و باوەڕت پێی هەبێت).

ئێستاش برای ئازیزم!

دەبێ باوەڕدارانی هاووێنەی تۆ لە ڕۆشنایی ئەم نموونەیەوە بیر بکەنەوە کاتێ منالێکیان کۆچی دوایی دەکات. واتە دەبێ بەم جۆرە بیر بکەنەوە:

(ئەم منالە بێ گوناهـ و پاکە.. بەدیهێنەریشی تابلێی خاوەنی بەزەیی و میهرەبانە.. میهرەبانی و چاودێریی ئەو خواوەندە گەورە و میهرەبانەش بردیەوە بۆ لای خۆی لە بریی ئەو دڵسۆزی‌یە کورت و پەروەردە کەموکووڕەی من و، لە بەندیخانەی ئێش و ئازار و بەڵای دنیا دەربازی کرد و ناردی بۆ بەهەشتە گەورە و ڕازاوەکەی خۆی.. خۆزگەم بە خۆی! چەندە بەختیارە! یاخوا پیرۆز و نۆشی گیانی بێت! کێ دەزانێت گەر لێرە بمایەتەوە چیی دەکرد؟ هەڵسوکەوتی لەم دنیایەدا چۆن دەبوو؟ هەر لەبەر ئەوەشە کە خەفەتی بۆ ناخۆم و بە بەختەوەری دەزانم.

ماوەتەوە بیرێك لە سوودی تایبەتیی خۆم بکەمەوە.

بەڵێ، ئەگەر بمایە، ئەوپەڕی ئەو سوودەی کە لێیەوە دەستم دەکەوت هێندە دەبوو کە دەیتوانی بۆ ماوەی دەساڵێك خۆشەویستی‌یەکی ئاوێتەی ئازاری دنیام بۆ دابین بکات. دوای ئەوەش ئەگەر کوڕێکی باش و دڵسۆز و لە کاروباری دنیادا لێهاتوو بوایە، لەوانەیە هەندێ یارمەتی و هاوکاریی لەگەڵمدا بکردایە.

بەڵام بە مردنەکەی خۆشەویستی‌یەکی بێگەردی دەیان ملیۆن ساڵی بەهەشتی هەمیشەیی بۆ دەستەبەر کردم و، بوو بە تکاکارم لە لای خواوەندی میهرەبان، تاکو منیش بڕۆمە بەهەشتی هەمیشەیی خانەی بەختیاری. کەواتە

ئەگەر بەرژەوەندیی خۆیشم لێك بدەمەوە، دەبێ هیچ خەفەتێك نەخۆم، چونکە هەر شتێك کە خوا ویستی لەسەر بوونی هەبێت، هەر دەبێ ببێت. لە لایەکی تریشەوە: ئەگەر کەسێك سوودێکی گومان لێکراوی خێرای لە دەست دەرچووبێت، بەڵام لە هەمان کاتدا هەزار سوودی بێ گومانی داهاتووی ماوەیەك درەنگی بۆ بەجێ مابێت، هەرگیز خەفەت و ئازار دەرنابڕێت و نائومێدی سەری تێ ناکات).

● خاڵی سێهەم:

ئەم منالەی کە کۆچی دوایی کردووە، بەندە و بەدیهاتووی خوایەکی میهرەبان و خاوەن بەزەیی بوو، هەروەك هاوڕێ و برادەرێك بوو خوای گەورە لە لای دایك و باوکی دانابوو، تاکو لە ژێر چاودێریی ئەواندا بمێنێتەوە. هەروەها خواوەند ئەو دایك و باوکەی کردبوو بە دوو خزمەتکاری دلسۆزی ئەو منالە.

پاداشتی پێشەکی و زووی ئەو خزمەتەیشی پێ بەخشیبوون، کە ئەو بەزەیی و شەفەقەتە بەتام و چێژەی باوك و دایکە بەرامبەر منالەکانیان. وا ئێستاش هەر ئەو بەدیهێنەرە خاوەن سۆز و بەزەییە کە - لە هەزاردا نۆسەد و نەوەد و نۆ بەشی ئەو منالە هی ئەوە - گەر میهرەبانی و دانستەکەی خواستیان وا بوو منالەکە ببەنەوە و کار و ئەرکەکانی ئەستۆی کۆتایی پێ بهێنن، ئایا دەبێ مرۆڤی موسڵمان و ئەهلی ئیمان بگرین و نائومێدی دەربرن؟ یان ئایا دەگونجێ دەست بکەن بە شین و هاوار و گریان، کە ئەمەش - لە ڕاستیدا - دەبێتە سکاڵا کردن لە خاوەنی هەزار بەشەکە لە بەرامبەر بەشێکی ساکاری بچووکەوە؟

ئەم چەشنە ڕەفتارە تەنها لە بێ ئاگا و گومڕایانەوە دەوەشێتەوە، نەك ئیمانداران!

● خاڵی چوارەم:

ئەگەر دنیا هەتاهەتایی بوایە..

ئەگەر مرۆڤ تیایدا هەمیشەیی بوایە..

یان:

ئەگەر "جودایی" ئەبەدی بوایە..

ئەو کاتە نائومێدی و خەفەت و ئازار واتایەکی تێدا دەبوو.

بەڵام مادەم دنیا میوانخانەیەکی سەرەڕێیە، ئەوا ئەو منداڵە کۆچ کردووە بۆ هەر لایەك بڕوات، ئێمەش و ئێوەش - هەمووومان - بێ گومان دەڕۆین بۆ ئەوێ. ئەم مردنەش تەنها بۆ ئەو نییە، بەڵکو ڕاستە شەقامێکە بۆ هەموان. هەر کەسێك لەم سەرزەوییەدایە دەبێ ڕۆژێك پیایدا بڕوات.

جا لەبەر ئەوەی جودایی هەمیشەیی نییە، ئەوا لە ڕۆژانی داهاتوو، چ لە بەرزەخ و چ لە بەهەشتدا، بە یەکتر شاد دەبنەوە. هەر لەبەر ئەوەشە کە پێویستە مرۆڤ لە هەڵوێستێکی وادا بڵێت:

(ئەمە فەرمانی خوایە و.. هەر ئەو بەخشیویەتی و هەر ئەویش بردوویەتیەوە).

هاودەم لەگەڵ ئەمەشدا، دەبێ کاڵای ئارامگرتن و شوکرانەبژێری بپۆشین و بڵێین:

"الحمد لله على كل حال".

● خاڵی پێنجەم:

میهرەبانی(شەفەقەت) ناسکترین و جوانترین و شیرینترین و پاکترینی درەوشانەوەکانی میهرەبانیی خواوەندە و، ئیکسیرێکی نوورانییە و، لە عیشق گەلێ کاریگەرترە و، کورتترین و زووترین ڕێگا و هۆی گەیشتنیشە بە خواوەندی گەورە.

بەڵێ، هەروەك عیشقی مەجازی و عیشقی دنیایی - دوای بڕینی چەند قۆناغێکی سەخت - مرۆڤ دەگەیەننە "عیشقی حەقیقی" و، لەوێوە خاوەنەکەی بە خوای باڵادەست دەگات، میهرەبانی و شەفقەتیش بە هەمان جۆرە؛ دڵی مرۆڤ بە خوای خۆیەوە پەیوەست دەکات، تاکو لە کورتترین ڕێگا و بە جوانترین شێوە و بە بێ هیچ سەختی و گیروگرفتێکیش، بە خوای خۆی شەرەفمەند ببێت.

بێ گومان دایك و باوك - یان هەرکامێکیان - منالەکەیان خۆش دەوێت و پارچەیەکە لە جگەریان. جا هەرکاتێك منالّ لە باوکی دەسێنرێتەوە، گەر ئەو باوکە بەختەوەر و ئیماندار بێت، ڕوو لە دنیا وەردەچەرخێنێت و بەخشندەی ڕاستەقینە دەبینێتەوە و دەڵێت:

(مادەم دنیا دەبڕێتەوە، ئەوا شایانی دڵ پێوە بەستن نییە. خۆ ئەو منالە بۆ هەر لایەك بڕوات، مرۆڤ هەست دەکات کە جۆرە پەیوەندییەکی تایبەتیی لەگەڵدا هەیە).

بەم جۆرە سوودێکی مەعنەویی بەرز و گرنگی دەست دەکەوێت.

ئەم مزگێنی و مژدانەش تەنها بۆ ئیماندارانن. چونکە بێ ئاگا و گومڕایان لە مزگێنی و بەختەوەریی ئەم پێنج "ڕاستی"یە بێ بەشن.

دەتوانن ئەو بارە دەروونییە ئازاربەخش و بەسۆیەی ئەوانتان بۆ دەربکەوێت کاتێ کە هەریەك لەوان بەم جۆرە بیر دەکاتەوە و دەبینێت:

تاقانەیەکی هەیە و زۆریشی خۆش دەوێت، کەچی ئێستا لە سەرەمەرگدا دەیبینێتەوە و، بیر لە سبەینێی ئەوماڵەی دەکاتەوە لە بریی جێگا و پێخەفی نەرمی ماڵەوەی لەناو خاکدا ڕاکشاوە. هێندەش بە هەڵەدا چووە کە - بە ئەندێشەی خۆی - پێی وایە مردن "نەبوون" و "جودایی"یەکی هەمیشەییە و، لە لایەکی تریشەوە وا تێدەگات کە مرۆڤ بە هەتاهەتایی لە دنیادا

دەمێنێتەوە. ئنجا بە هیچ جۆرێکیش سۆز و بەزەیی خواوەندی میهرەبان و، نیعمەت و بەهەشتە ڕازاوەکەی ئەوی بە دڵدا نایەت!

تۆش دەتوانیت ئەمە بکەیت بە تەرازوویەك و ئەو خەفەت و ئازار و نائومێدیيەی ئەوانی پێ هەڵبسەنگێنیت، کە تەنانەت تروسکاییەکیش ڕووناکیی تێدا بەدی ناکەیت، با بۆ خۆت بزانیت تا چ ڕادەیەك تاریك و پڕ لە نائومێدیيە.

کەچی لە هەمان کاتدا ئیمان و ئیسلام - کە هۆی بەختەوەریی هەردوو دنیان - بە مرۆڤی باوەڕدار دەڵێن:

ئەم منداڵەی کە ئێستا لە ئازاری سەرەمەرگدایە، دوای دەربازکردنی لەم دنیا کەم نرخ و فانیيە، بەدیهێنەری میهرەبانی دەینێرێت بۆ بەهەشتی بەرینی خۆی و، دەیکات بە تکاکارت لە ڕۆژی دواییدا. پاش ئەوەش دەبێت بە منداڵێکی خۆشەویستی هەمیشەییت.

کەواتە، مەشڵەژێ و هەرگیز خەفەت مەخۆ، چونکە ئەم جودایی و لێکدابڕانەی نێوانتان بۆ ماوەیەکی کاتی و کەم خایەنە. دەسا بۆ خۆت ئارام بگرە و، بڵێ:

"الحكم لله".

﴿إنّا لله وَإنّا إليهِ راجِعُون﴾.

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

# لە بارەی ﴿وِلْدَانٌ مُخَلَّدُون﴾ەوە

باسمه سبحانه

ئەو ڕوونکردنەوەیەی ئایەتی پیرۆزی: ﴿وِلْدَانٌ مُخَلَّدُون﴾ کە لە پەیامی: "پرسەی منالێك"دا باس کراوە، جیایە لەوەی کە بەشێك لە تەفسیرە کۆنەکان دەلێن:

لە بەهەشتدا هەموو مرۆڤێك هەر لە بچووکترین منالەوە تا گەورەترین پیر، لە تەمەنی سی و سێ سالیدا دەبن.

حەقیقەتی ئەمە - واللّٰه أعلم - ئەمەی خوارەوەیە:

ئەم ئایەتە پیرۆزە بە ڕاشکاوی دەستەواژەی: ﴿ولــدان﴾ی بەکارهێناوە، کە ئەمەش وا دەگەیەنێت:

ئەو منالە بچووکانەی پێش بالغ بوونیان مردوون و، بۆ بەجێهێنانی فەرزەکانی شەرع زۆریان لێ نەکراوە و، خۆیشیان لە ڕووی سوننەت و تەطەووعەوە ئەو فەرزانەیان ئەنجام نەداوە.. ئەو منالانە، لە بەهەشتدا هەر بە منالی و خۆشویستراوی و بە هەمیشەیی دەمێننەوە، بە چەشنێك شیاوی بەهەشت بێت.

بەلام ئەوانەی گەیشتوونەتە تەمەنی حەوت سالی و، دایك و باوکیان - لەبەر فێرکردن و ڕاهێنان - بۆ جێبەجێ کردنی فەرزەکان هانیان داون و،

لە دە ساڵیدا زۆریان لێ كردوون، وەك شەرع داوای كردووە، ئەوانیش لە حەوت ساڵی‌یەوە تا باڵغ بوون فەرزەكانیان - لەو ڕووەوە كە بۆ ئەوان سوننەتە، نەك فەرز - بەجێ‌هێناوە و، وەكو گەورەكان بەڕۆژوو بوون..

ئەوانە، بە چەشنی مرۆڤە گەورە ئایینداره‌كان پاداشت دەدرێنەوە و، لە بەهەشتدا - وەك ئەوان - لە تەمەنی سی و سێ ساڵیدا دەبن.

هەندێ تەفسیر ئەمەیان كردووە بە گشتی بۆ هەموو منداڵێك و، بێ ڕوونكردنەوەی ئەم ڕاستی‌یە، لەو گومانەدان كە حوكمی ئەم ئایەتە گشتی بێت، كەچی تایبەتی‌یە.

**سەعیدی نوورسی**

# لالآنەوەیەك!

ئەی ئەو خۆشەویستانەم کە گوێ لەم یادخەرەوانە ڕادەگرن!
بزانن:
من هەندێ جار لالآنەوەکانی دڵی خۆم دەنووسم کە بۆ پەروەردگاریان دەکەم، هەرچەند دەبوو بشاررانایەتەوە و نەنووسرانایە. چونکە لە میهرەبانیی خوای گەورە ئومێدەوارم کە کاتێ مردن زمانمی بێ دەنگ کرد، گوفتاری نووسینەکەمم لە بریی زمانم لێ وەربگرێت.
بەڵێ، تۆبەی زمانم لەم تەمەنە کورتەمدا هەموو گوناهە زۆرەکانم ناگرێتەوە و فریایان ناکەوێت. لەبەر ئەوە، دەمکردنەوەی نووسینە چەسپاو و بەردەوامەکەم دەتوانێت هەموو ئەو گوناهانە بەسەر بکات و بیانگرێتەوە!
ئەوەبوو سیازدەساڵ پێش ئێستا و، لە کاتی شڵەژانێکی مەزنی باری ڕۆحی و گۆڕانی پێکەنینی "سەعیدی کۆن" بۆ گریانی "سەعیدی نوێ" بە بەرەبەیانی پیری لە خەوی شەوگاری لاوی بێداربوومەوە و، ئەم موناجات و لالآنەوەیەم بە عەرەبی نووسی، کە ئەمە واتای هەندێکیەتی:
ئەی پەروەردگاری میهرەبان و خواوەندی بەخشندەم!
بەهۆی ئەوەی کردەوەی خراپم هەڵبژارد، تەمەن و لاویم لەدەست دەرچوو، ئەو بەرهەمانەشیان کە لە دەستمدا ماون، تەنها گوناهە پڕ ئێش و ئازارەکانیانە کە مرۆڤ ڕسوا و شەرمەزار دەکەن و زیانی پێ دەگەیەنن و لە

ڕێ لایدەدەن و، چەند وەسوەسەیەکن مرۆڤ بێزار و دەستەپاچە و کۆڵەوار دەکەن.

خۆ منیش بە بینین بۆم دەرکەوتووە کە بەوپەڕی پەلە و خێرایی و بێ هیچ لادان و ویستێکی خۆم و، بە چەشنی باوك و، باپیران و، خۆشەویستان و، خزمان و، هاوڕێیانم، لە دەرگای گۆڕ نزیك بوومەتەوە، کە خانەی تەنیاییە لە ڕێگای هەمیشەییدا، بۆ لێکدابڕانی هەتاهەتایی لەم خانەیەی کە بە دڵنیایی دەزانم خانەیەکی فانی و تیاچووە و، وەك بینراوە هەردەم لە ئاوابوون و کۆچکردندایە، بە تایبەت بۆ یەکێکی وەك منی خاوەن نەفسی بەدخوازی غەددار و فێڵباز.

دەسا ئەی پەروەردگاری میهرەبان و بەخشندەم!

بەم نزیکانە، دەبینم کفنەکەمم پۆشیوە و ڕۆشتوومەتە تابووتەکەم و ماڵئاواییم لە خۆشەویستانم کردووە و، ڕووەو دەرگای گۆڕەکەم کەوتوومەتە ڕێ. وا لە دەرگانەی میهرەبانیی تۆدا دەلالێمەوە و هاوار دەکەم:

الأمان.. الأمان.. يا حنان يا منان!

لە خەجاڵەتیی گوێڕایەڵی نەکردنت ڕزگارم بکە.

ئاخ.. وا کفنەکەم بە ئەستۆمەوەیە و لەسەر قەبرەکەم ڕاوەستاوم و سەرم بۆ دەرگانەی بەزەییت بەرز دەکەمەوە و، هانات بۆ دەهێنم و دەڵێم:

الأمان.. الأمان.. يا رحمن يا حنان!

لە قورسیی باری گوناه ڕزگارم بکە.

ئاخ وا من بە کفنەکەم پێچراومەتەوە و، لە گۆڕەکەمدا نیشتەجێ بووم و ڕەوانەکەران بەجێیان هێشتووم و، چاوەڕێی لێبوردن و میهرەبانیتم و، بە چاو دەبینم کە جگە لای تۆ هیچ پەنا و دالدەیەك نییە و، هاوار دەکەم:

الأمـــان.. الأمـــان.. لەدەست تەنگیی جێگـا و بێ هـاودەمیی ئـەنجامی تاوانباری و، لە دەست ناشیرینیی ڕووی گوناهەکان..

یارحمن.. یاحنان.. یامنان.. یادیان!

لە هاوەڵێتیی گوناهـو تاوان ڕزگارم بکە.

ئەی خوای گەورەم!

تەنها میهرەبانی و بـەزەیی تـۆ داڵـدە و پەنامـە، سـکاڵای خـەم و پەژارەشـم هەر تەنها بۆ لای تۆیە.

ئەی بەدیهێنەری بەخشندە و پەروەردگاری میهرەبان و گەورەم!

ئەم سەعیدە بەندە و بەدیهێنراوەی خۆت، کە هـەم لاسـار، هـەم کۆڵـەوار، هەم بێ دەستەڵات، هەم بـێ ئاگـا، هـەم نـەزان، هـەم بیمـار، هـەم زەلیـل، هـەم خراپکـار، هـەم بەسـاڵاچوو، هـەم بەدبـەخت و، هـەم لـە گـەورەی خـۆی هەڵـهاتوو.. وا دوای چل ساڵی هەڵـهاتن، گەڕاوەتـەوە و هانـا و پـەنای بـۆ میـهرەبانیی تـۆ هێنـاوە و، دان بـە تـاوان و گوناهـەکانیدا دەنێـت و، گرفتـاری چەندین وەهـم و نەخۆشی بووە و، لێت دەپاڕێتەوە..

جا ئەگەر وەری بگریت و لێی خۆش ببیت و بـەزەییت پێیـدا بێتـەوە، ئـەوا تۆ ئەهل و شایانی ئەوەیت و لە هەموو میهرەبانێك میهرەبانتریت. دەنا پـەنا بۆ چ دەرگایـەکی جگـە لــە دەرگـای تـۆ ببـات؟ لــە کـاتێکدا کـە تەنـها تـۆ پەروەردگاری مەبەست و حەقی پەرستراویت؟

لا إله إلاّ أنت وحدك لا شريك لك.

آخر الكلام في الدنيا وأول الكلام في الآخرة وفي القبر:

أشهد أن لا إله إلاّ الله، وأشهد أنّ محمداً رسول الله، صلى الله تعالى عليه وسلم.

# پێویستیی فێرەت

برا ئازیزە بەوەفاکانم!

"منالە خاوێن و بێ تاوانەکان" لە پێشەکیی هەموو ئەوانەوەن کە دەبن بە قوتابیی ڕاستەقینەی پەیامەکانی نوور، بەپێی داخوازی سروشتیان و، ڕووداوەکانی سەردەم. چونکە ئەو منالە ئەگەر هەر لە کاتی منالّیدا وانەیەکی ئیمانیی بەهێز وەرنەگرێت، گەلێ دژوارە دوایی پایەکانی ئیمان و ئیسلام لە ڕۆحیدا جێگیر ببێت، تەنانەت کارێکی یەکجار قورس و پڕ گیروگرفت دەبێت، بە چەشنی ئەوەی داوا لە ناموسلّمانێك بکرێت ئیسلام وەربگرێت! بەڵکو زیاتر لەوەش بەلایەوە نامۆ دەبێت! بە تایبەت ئەگەر دایك و باوکی خۆی بە تەقوا و ئاییندارییەوە نەدیبێت و، مێشکیشی تەنها بە زانستە دنیاییەکان ئاخنرابێت و گۆش کرابێت..

لەم حاڵەتەدا، ئەم منالە لە بریی ئەوەی چاکە لەگەڵ دایك و باوکیدا بکات، بە ئەرکێکی قورسیان دەزانێت و چاوەڕوانی مردنیان دەبێت! لە قیامەتیشدا شەفاعەتکاریان نابێت، بەڵکو سکاڵایان لەدەست دەکات و دەڵێت:

(بۆچی ئیمانتان نەپاراستم و لەسەر ئیسلامەتی پەروەردەتان نەکردم)؟!

جا لەسەر بناغەی ئەم ڕاستییە:

بەختەوەرترین منالّ ئەوانەن کە ڕۆشتوونەتە ناو بازنەی پەیامەکانی نوورەوە. چونکە ئەوان بەرامبەر باوکان و دایکانیان باش و خزمەتگوزاری بێ وەی و ئەمین دەبن بۆیان و، ڕێزی شایانیان دەگرن و، دوای مردنی

باوکان و دایکانیان، بە کردەوە چاکەکانی خۆیان، چاکە لە دەفتەری کردەوەکانی ئەو دایك و باوکانەدا تۆمار دەکەن و، لە قیامەتیشدا - هەر کەس بەپێی پلەی خۆی - شەفاعەتیان بۆ دەکەن.

بەشی دووهەمی قوتابیانی نوور: ئەو ئافرەتانەن کە لە سروشتی خۆیاندا هەست بە پێویستی دەکەن بۆ پەیامەکانی نوور. بە تایبەت ئەوانەی کە کەمێك لە دنیا دوورە پەرێزن. تەنانەت ئەوانەی دەستیان لێ داتەکاندووە، چونکە گەیشتوونەتە پلەیەکی بەرزی تەمەن.

پەیامەکانی نوور بۆ ئەوانە خۆراکێکی مەعنەوییە، چونکە یەکێك لە بناغەکانی پەیامەکانی نوور "شەفەقەت"ە، کە یەکێکە لە جیلوەکانی ناوی: "الرحیم"ی خوای گەورە و، لە هەمان کاتیشدا هەوێن و کاکڵە و گەوهەری تایبەتیی ڕەگداکوتاوی ناو سروشتی ئافرەتە و، تایبەتمەندیی سەرەکییانە.

بەشی سێهەم: ئەو نەخۆش و پیرانەن کە بە وێنەی پێویستییان بە نان و دەرمان، پێویستیان بە پەیامەکانی نوورە، با بە شێوەیەکی ناسروشتیش بێت. چونکە پەیامەکانی نوور بە وێنەی ڕووناکیی خۆری ناوجەرگەی ئاسمان ژیانی هەمیشەییان بۆ ڕوون دەکاتەوە و ماهییەتی ژیانی فانیی دنیایان پێش چاو دەخات. جا ئەو کەسانەی کە بەهۆی "نەخۆشی" یا "پیری"یەوە ئازار بە ژیانیان گەیشتووە و ئەوانەش کە مردن بە ئیعدامی هەمیشەیی دادەنێن، بەهۆی بێ ئاگایی و گومڕایی دەوروبەریان، هەموو ئەوانە پێویستیان بەو دڵنەوایی و دڵدانەوە و نووری ئومێدە هەیە کە لە پەیامەکانی نووردایە. بە ڕادەیەك کە "نەخۆشی" و "پیری"یان هێندە لەلا شیرین دەکات کە فەزڵی بەسەر "تەندروستی" و "لاوی"دا بدەن!

**سەعیدی نوورسی**

# پوختەیەک لە ژیانی دانەر

* ناوی "بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی"یە.

* لە نێوان چیا بڵندەکان و لە گوندی "نوورس"ی سەر بە پارێزگای "بەدلیس"ی کوردستانی ژێر دەستەڵاتی عوسمانی لە بنەماڵەیەکی کوردی دیندار لەدایك بووە.

* لە نێوان ساڵەکانی (١٨٧٦-١٩٦٠ز)دا ژیاوە.

* "صۆفی میرزا"ی باوکی بە خواپەرستی و پیاوچاکی بەناوبانگ بووە و، هەر خۆراکێك حەڵاڵ نەبووبێت دەرخواردی مناڵەکانی نەداوە.. خاتوو "نووریە"ی دایکیشی بە پاك و خاوێنی و دەستنوێژەوە نەبووبێت شیری بە مناڵەکانی نەداوە!

* دایکی لە کاتی جەنگی جیهانیی یەکەم و، باوکیشی لە ساڵەکانی بیستی سەدەی پێشوودا کۆچی دواییان کردووە و، لە گۆڕستانی گوندی نوورس نێژراون.

* چوارەم مناڵی خانەوادەکەیانە کە یەك لە دوای یەك ئەمانەن: (دوڕڕییە، خانم، عەبدوڵڵا، سەعید، محەممەد، عەبدولمەجید، مەرجان).

* لە تەمەنی چواردە ساڵیدا بڕوانامەی زانایی لە زانستە ئیسلامییەکاندا بەدەست هێناوە.

* بە هەوڵ و تەقالای خۆی شارەزایی لە زانستەکانی ڕۆژگاردا، وەك: کیمیا فیزیا، بایۆلۆجی، جیۆلۆجی، بیرکاری، گەردوونناسی، جوگرافیا، هتد.. پەیدا کردووە.

★ لەبەر زیرەكیی ناوازە و لە ڕادەبەدەری، نازناوی (سەعیدی مەشهوور) پاشان (بەدیعوززەمان)ی لە لایەن زانایانەوە پێ دراوە.

★ یەكەم كەسە هەوڵی داوە بۆ دامەزراندنی زانكۆ لە كوردستاندا و، كردنەوەی قوتابخانەی كوردی و، خوێندنی وانەی زانستەكانی سەردەم شان بە شانی زانستە ئاینییەكان.

★ گەورەترین كەسایەتیی كوردی ئەم سەردەمە و مەزنترین زانایە كە لە دوای مەولانا خالیدی نەقشبەندی لەناو نەتەوەی كورددا هاتووەتە دنیاوە و، ناوبانگی جیهانیی بۆ دروست بووە و، لە ڕووبەرێكی فراوانی سەر زەویدا سوود لە بەرهەمەكانی وەردەگیرێت.

★ تاكە كەسایەتی بووە كە هەموو زەبر و زەنگێكی مستەفا كەمال و دامودەزگا چەوسێنەرەكانی و سی و پێنج ساڵی بەندی و زیندانی تاكە كەسی و ڕەهەندەیی و دەست بەسەری و دەیان دادگای تۆقێنەر نەیانتوانیوە چۆكی پێ دابدەن و لە خەباتی ڕەوای خۆی كۆڵی پێ بدەن. تەنانەت ئەو توانیویەتی سەركەوتنیشیان بە سەردا بە دەست بهێنێت.

★ زیاتر لە سەد و سی كتێب و نامیلكەی لە ژێر ناونیشانی (سەرجەمی پەیامەكانی نوور)دا نووسیوە و بڵاوی كردوونەتەوە.

★ وەرگێڕانی سەرجەمی پەیامەكانی نوور بۆ (زمانی عەرەبی) لە لایەن مامۆستا (ئیحسان قاسم صالحی)یەوە تەواو بووە و، لە دە دانە بەرگی قەشەنگدا و لە هەردوو شاری ئەستەمبووڵ و قاهیرە چەند چاپێكی یەك لە دوای یەكیان تا ئێستا لێ بڵاوكراوەتەوە.

★ بەشێكی زۆریشیان لە لایەن خوشكی نۆموسڵمان: ماری وێڵد (شوكران واحیدە)وە كراون بە (زمانی ئینگلیزی) و، تا ئێستا پێنج بەرگی گەورەیان بە چاپی جوان و مۆدێرن بەو زمانە لێ بڵاو كراوەتەوە.

* بە (زمانی کوردی)ش تا ئێستا پێنج بەرگی گەورەی بە شێوەیەکی نایاب لێ چاپکراوە، جگە لە سی کتێب و نامیلکەی سەربەخۆ.
* ئەم پەیامانە بۆ چل و حەوت زمانی نەتەوەکانی جیهان وەرگێڕراون، کە تا ئێستا کاری وەرگێڕان تیایاندا بەردەوامە، وەك زمانەکانی:

ئەڵمانی، فەرەنسی، ڕووسی، ئۆردی، فارسی، ئیتالی، کۆجاراتی، مەلایا، ڕۆمانی، چینی، بولگاری، پورتوگالی، ئەلبانی، بۆسنی، ئیسپانی، مەقەدۆنی.. هەروەها گەلێ زمانی تریش.

* تا ئێستا زیاتر لە پازدە کۆنگرەی جیهانی و دەیان کۆڕی زانستی و پێشبڕکێی ڕۆشنبیریی لە ئاستی جیهاندا لەسەر کراوە و، دەیان کتێب و، سەدان لێکۆڵینەوەی لەسەر نووسراوە و، چەندین بەڵگەنامەی زانکۆییشی لە خوێندنی باڵادا لەسەر وەرگیراوە، کە هەندێکیان لە کوردستاندا بووە.
* دواهەمین کۆنگرەی جیهانی لەسەر مامۆستا بەدیعوززەمان لە شاری ئەستەمبووڵ لە بەرواری (٣-٥/١٠/٢٠١٠ز)دا ساز کرا و، چەندین کەسایەتیی زانستی لە (چل و چوار) وڵاتەوە بەشدارییان تێدا کرد کە توێژەرانی (سی و سێ) وڵات لەوانە سەد و پێنج دانە توێژینەوەی زانستییان پێشکەش کرد.
* لە کوردستانی باشووریشدا، هەتا ئێستا سێ سیمینار تایبەت کراوە بە مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی، لە شارەکانی (هەولێر، سلێمانی، سۆران). هەروەك تا ئێستا سێ مزگەوت بە ناویەوە ناونراوە لە شارەکانی (سلێمانی، سۆران، کەرکووك).

* * *

# پێرستی بابەتەکان

**بابەت** | **لاپەڕە**

# پۆزش

ئەو باسەی کە لە لاپەڕە (٧٤-١٢٠)ی ئەم کتێبەدایە بە ناونیشانی: (هۆ و نهێنیی بەدبەختیی گومڕایان و بەختەوەریی ئیمانداران) مامۆستا سەعیدی نوورسی لە هەردوو (ڕابەری لاوان) و (ڕابەری خوشکان)دا دایناوە. ئێمە لە چاپی یەکەمی هەردووکیاندا، لەبەر گرانیی چاپ، تەنها لە (ڕابەری خوشکان)دا بڵاومان کردەوە. ئێستاش لەم چاپە نوێیانەدا، لەبەر هەمان هۆکار، تەنها لەم ڕابەرەدا دامان نایەوە. تکایە خوێنەرانی کتێبی (ڕابەری لاوان)یش بفەرموون لە (ڕابەری خوشکان)دا بیخوێننەوە.

پێویستە ئەوەش بخەینە ڕوو کە هەموو تاك و خێزانێکی ئیماندار پێویستی بە باسەکانی هەردوو ڕابەرەکە دەبێت و، هەردووکیان تەواوکەری یەکترین.

## (پەیامەکانی نوور) بە زمانی کوردی

بە پشتیوانیی خوای گەورە لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی بیستەمەوە هەتا ئێستا ئەم کتێبانەی خوارەوەمان بە کوردی بڵاوکردووەتەوە:

### یەکەم: لە شێوەی کتێب و نامیلکەی سەربەخۆدا

١ - پەیامی بیماران (چاپی سێهەم)

٢ - پەیامی پیران (چاپی دووهەم)

٣ - وتە بچووکەکان (چاپی سێهەم)

٤ - سروشت هونەرە یان هونەرمەند؟! (چاپی دووهەم)

٥ - مەلائیکەت و ژیانی دوارۆژ (چاپی دووهەم)

٦ - پەیامی ڕەمەزان (چاپی هەشتەم)

٧ - حیکمەتی خۆپەنادان لە شەیتان (چاپی دووهەم)

تێبینی: ئەم پەیامە لەگەڵ کتێبی ژمارە (٢١)یشدا بڵاوکراوەتەوە.

٨ - پەیامی ئیخلاس و برایەتی (چاپی سێهەم)

٩ - زڵلەی میهرەبانی (چاپی سێهەم)

١٠ - چارەسەری وەسوەسە (چاپی شەشەم)

١١- مرۆڤ و ئیمان (چاپی چوارەم)

١٢ - بەری درەختی ئیمان (چاپی دووهەم)

١٣ - موعجیزاتی ئەحمەدی (چاپی چوارەم)

١٤ - ئیجتیهاد لەم سەردەمەدا (چاپی دووهەم)

١٥ - پەنجەرەکان

١٦ - پەیامی حەشر (چاپی دووهەم)

١٧ - (من) خودیی مرۆڤ و بزووتنی گەردیلەکان لە نێوان فەلسەفە و ئاییندا (چاپی دووهەم)

١٨ – ڕابەری لاوان (چاپی سێهەم)
١٩ – ڕابەری خوشکان (چاپی سێهەم)
٢٠ – ڕابەری خزمەتگوزارانی قورئان (چاپی دووهەم)
٢١ – ڕاستی‌یەکانی ئیمان
٢٢ – ڕاستیی تەوحید
٢٣ – شوکرانەبژێری (چاپی دووهەم)
٢٤ – بینینەکانی گەشتیارێك
٢٥ – میعراجی پێغەمبەر ﷺ (چاپی دووهەم)
٢٦ – موعجیزاتی قورئانی
٢٧ – لاوێتیی قورئان
٢٨ – سوننەتی پێغەمبەر ﷺ پلیکانە و ڕێبازە (چاپی دووهەم)
٢٩ – نوورەکانی حەقیقەت
٣٠ – موناجات

ئەو کتێبانەی لە بازاڕدا نەماون، بە پشتیوانیی خوای گەورە، چاپ دەکرێنەوە.

**دووهەم: لە شێوەی کۆمەڵە پەیام و بەرگی گەورەدا:**

١ – (وتەکان)
٢ – (مەکتووبات)
٣ – (بریسکەکان)
٤ – (تیشکەکان)
٥ – (پاشبەندەکان)

**خوا یار بێ بەرگەکانی تریش بە دەستەوەن کە یەك لە دوای یەك بە کوردی چاپ بکرێن.**

* * *

# مرشد الأخَوات

من كليات رسائل النور التي ألفها:

**الأستاذ بديع الزمان سعيد النورسي**

ترجمها من التركية إلى العربية: **الأستاذ إحسان قاسم الصالحي**

نقلها من العربية إلى الكردية: **فاروق رسول يحيـــى**

الطبعة الثالثة (المنقحة)

١٤٣٣هـــ/٢٠١١م

*  *  *

# A GUIDE FOR WOMEN

From the Risale-i Nur Collection

By:

Bediuzzaman Said Nursi

Translated from Arabic into Kurdish by:

Farooq Rasool Yahya

2011


ڕابەری خوشکان
سەعیدی نووری